# ڕێگا بەرەو قورئان



ابراهیم بن عمر السکران

وەرگێڕانی

ئالان عمر سلێمان

2019

# ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب بەعەرەبی: الطريق إلى القران

ناوی کتێب بەکوردی: رێگا بەرە و قورئان

نووسەر: إبراهيم بن عمر السكران

وەرگێڕ: ئالان عمر سلێمان

دیزاینی بەرگ: سەنگەر شوانی

دیزاینی ناوەوە: گروپی ڕۆشنایی

تەفسیر: تەفسیری ئاسان

چاپ: چاپی یەکەمی ٢٠١٩

چاپخانە:

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (        )ی ساڵی ٢٠١٩ی پێدراوە.

# ناوەرۆک:

## دەستپێك..

سوپاس بۆخوا..

زۆرجار قسەی هەندێك لە پیاوچاکان، کە باسی ژیانی دەستەیەکی جیاواز دەکەن، سەرسامم دەکات، یان لەبارەی تێگەیشتن و تێڕوانین و بیرکردنەوەی دروستی تاخمێك بۆ بەرەکەتی قورئان..

زۆرجار قسەی هەندێك لە پیاوچاکان سەرسامم دەکەن، کاتێك باس لەو خۆشییە ڕۆحییە دەکەن لە کاتی خوێندنەوەی قورئان لە دەروونیان بەدەستی دەهێنن، باس لە شتێك دەکەن کە هەستی پێ دەکەن، ئەوان بە هێزی ئیرادەیان لە (کردنی چاکە و ڕێگریکردن لە خراپە) بە هەستەوەرەکانیان دەست لەم خۆشییە دەدەن. باس لەو هەستە ئاسوودەییە دەروونییەیان دەکەن کە لەبەرامبەر بوونی ئەو ملامنێییە فیکریی و بەربەرەکانییە کۆمەڵایەتیانەی ئەمڕۆ هەنە بە دەستی دەهێنن.

بەڵکو لەسەرووی هەموو ئەمانە شەرەفمەندی پێغەمبەرﷺ بە خودی قورئان، سەرسامم دەکات، ساتێکە کە گەورەی نەوەکانی ئادەم بە کتێبی خوا شەرەفمەند دەبێت..

سەیرکە چۆن قورئان حاڵی پێغەمبەرﷺ پێش قورئان و دوای قورئان وێنە دەکێشێت، وەك پەروەردگار دەفەرموێت ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ رُوحٗا مِّنۡ أَمۡرِنَاۚ مَا كُنتَ تَدۡرِي مَا ٱلۡكِتَٰبُ وَلَا ٱلۡإِيمَٰنُ ﴾ الشورى ٥٢: واتە"ئا بەو شێوەیەی کە دەیزانی(ئەی محەمەد ﷺ ) ئێمە قورئانمان بۆ ڕەوانە کردیت لەلایەن خۆمانەوە (کە ژیانبەخشە بە ڕۆح و گیان و عەقڵ)، تۆ نەتدەزانی قورئان چیە و ئیمان چیە".

هەروەها دەفەرموێت ﴿ نَحۡنُ نَقُصُّ عَلَيۡكَ أَحۡسَنَ ٱلۡقَصَصِ بِمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ وَإِن كُنتَ مِن قَبۡلِهِۦ لَمِنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ﴾ یوسف: ٣ واتە "ئێمە چاکترین و جوانترین چیرۆك و بەسەرهاتت بۆ دەگێڕینەوە ئەی محەمەد ﷺ بەهۆی ئەم قورئانەی کە نیگامان کرد بۆ لای تۆ، لەکاتێکدا بێگومان تۆ لە پێش ئەم قورئانەدا لەم بەسەرهاتە بێ ئاگا بوویت".

سەیری حاڵی پێغەمبەرﷺ بکە لە دوای دابەزینی قورئان لەسەری، کە چۆن بە قورئان کاریگەر بووە، بەڵکو لەوەش سەیرتر، حاڵی پێغەمبەرە ﷺ دوای پەیامی ئیسلام، بەوەی لەگەڵ جوبریل پێداچوونەوەی بە قورئان دەکرد، چۆن ئەو لە هەڵکردنی با دەستکراوەتر و بەخشندەتر بووە (وەك لە بوخاریدا هاتووە) ئەوە پێغەمبەری خوایە کە ئیمان و یەقینی خۆی تەواوکرد، لەگەڵ ئەوەشدا لەوکاتەی کاریگەر دەبوو بە قورئان، چالاکی لە خێرکردندا زیادی دەکرد. چ جای ئەوەی بگا بە حاڵی دەروونی بێهێزی ئێمە بۆ بەردەوامیبوون لەگەڵ قورئان.

بەڵکو سەیرکە چۆن خوا خاسیەتی ئەو پێغەمبەرەی تایبەتکردووە بە خوێندنەوەی قورئان ﴿ رَسُولٌ مِّنَ ٱللَّهِ يَتْلُوا۟ صُحُفًا مُّطَهَّرَةً ﴾ البينة: ٢

واتە "پێغەمبەرێکە لەلایەن خواوە کتێب و نامەی پاك و بێگەردیان بەسەردا دەخوێنێتەوە(کە قورئانە".

سەیری ئەو وێنە پڕجوانەی حاڵی ئەهلی ئیمان بکە چۆن شەونخونی لەگەڵ قورئان دەکەن ﴿ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴾ آل عمران: ١١٣

واتە "دەستەیەك لە ئیماندارانیان هەن، ئایەتەکانی خوا لەکاتەکانی شەودا دەخوێننەوە و نوێژدەکەن و سوژدە دەبەن (موسڵمانن بەهەموو واتایەك)".

ئایا تۆ وای دەبینی کاتێك خوای گەورە پەیامەکانی لە پێناو قوڵکردنەوەی پەیوەندی بەستن لەگەڵ قورئان بە هەمەجۆری و بە شێوازی جیاجیا ئاراستەدەکات، هەر وا و بێ بەرنامەیە؟

هەندێکجار زۆر بەرروونی بۆ وردبوونەوە و سەرنجدان لە قورئان هانمان دەدات ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ ﴾ محمد: ٢٤ واتە "ئایا ئەوە بۆچی ئەوانە وردبینی لە قورئاندا ناکەن و گوێی بۆ ناگرن؟!".

هەندێکجاریش بۆ گوێگرتن و تێفکرینی لێی ﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ ﴾ الأعراف: ٢٠٤ واتە "کاتێکیش کە قورئان دەخوێندرێت، گوێی بۆ بگرن و دڵی بدەنێ و بێ دەنگ بن".

هەندێکجاری دیش فەرمانمان پێ دەکات بە هونەری جوانخوێندن قورئان بخوێنین، بە دەنگێك کە دڵەکان بۆ نزیکبوونەوە لە قورئان دەفڕێنێت﴿ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴾ المزمل: ٤ واتە "دەوری قورئان بکەرەوە بە وردی و لەسەرخۆ".

هەندێکجاری تریش فەرمانمان پێ دەکات بەر لە خوێندنەوەی ئامادەسازی دەروونی بکەین، ئەویش بە پەناگرتن لە شەیتان، بۆ ئەوەی دەروونمان بۆ وەرگرتنی ناوەڕۆکەکەی بێ خەوش بێت﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾ النحل: ٩٨ واتە "کاتێك قورئانت خوێند و دەورت کردەوە، ئەوە پەنا بگرە بەخوا لە شەیتانی نەفرین لێکراو".

هەروەها هەندێکجاریش وەك هۆشداریدانێك بۆ ئێمە، لە حاڵەتی ناخۆشی(دوورکەوتنەوە لە قورئان) لە دەروونمان ئاگادارمان دەکاتەوە، ﴿ وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَٰرَبِّ إِنَّ قَوْمِى ٱتَّخَذُواْ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ مَهْجُورًا ﴾ الفرقان: ٣٠ واتە "دوای دوورکەوتنەوەی ئوممەت لە قورئان -پێغەمبەرﷺ سکاڵا دەکات و دەفەرموێت: پەروەردگارا بەڕاستی قەومەکەم وازیان لەم قورئانە هێناوە و پشت گوێیان خستووە و گرنگی پێ نادەن".

چەندان جاری تریش لە گەورەیی قورئان و بەئاسانکردنی قورئان ئاگادارمان دەکاتەوە ئایا کەسێك هەیە پەند و ئامۆژگاری لێ وەربگرێت؟

هەموو ئەمانە لە پێناو چەسپاندنی پەیوەندیمانە لەگەڵ قورئان.

ئایا پێت وایە هەموو ئەمانە بە ڕێکەوت و سودفە بوونە و هیچ بەڵگەیەکی ئاگادارکەرەوە و ترسناك لەخۆی ناگرێت؟

بەڵکو ڕەوایە ئەو قورئانەی کە پەروەردگار سوێندی پێ دەخوات، ستایشی خوێندنەوەی دەکات، کردوویەتیە گەورەترین و بەڕێزترین کتێبی ئاسمانی کە خۆی دایبەزاندوون، هەروەها بەڕێزترین مرۆڤی (موحەمەد ﷺ) بەو تایبەت کردووە، هەروەها لەبەرکردنی وشەکانی کردۆتە تایبەتمەندی ئەهلی زانست، ئایا ڕەوایە هەموو ئەو تایبەتمەندییە و شەرەف و گەورەییە بۆ قورئان هەبێت لە هەمان کاتیشدا بە کتێبێکی ئاسایی لە ژیانمان هەژمار بکرێت؟!

بێگومان ئەو شەڕەفە بۆ قورئان بریتییە لە ڕەنگدانەوەی گەورەیی ناوەڕۆك و واتا و مەبەستەکانی خودی قورئان، بۆیە بێگومان پێویستە ئەو قورئانە ئامادەیەکی ئەوتۆی هەبێت لە ژیانمان کە هاوتابێت بێت لەگەڵ گەورەییەکەی.

ئەو پەیامە بچوکەی لەبەر دەستدایە کۆی بەرهەمی بیکردنەوەکانە لەبارەی واقیعی قورئان لە ژیانماندا، لەگەڵ شوێنکەوتە هەستەوەری و مەعنەوەییە سەرنجراکێشەکانی.

وصلى الله وسلم على نبينا محمد واله وصحبه

أبو عمر[1]

ربيع الاول ١٤٣٣

[1] - ئیبراهیم عمر السكران ناسراو بە (أبو عمر)، بانگخوازی سعودی، خاوەن چەندان بەرهەمی نوسین و کتێبی بڵاوکراوەیە، پێش وەرگێڕانی ئەم کتێبە لەلایەن دەسەڵاتدارانی سعودی لە مانگی نیسانی ساڵی ٢٠١٦ دەستگیرکراوە، تا بڵاوکردنەوەی ئەم بەرهەمە بەزمانی کوردی، نە هۆکاری دەستگیرکردنەکەی دیارە، نە هیچ دەنگوباسی ناوبراو لە زیندان و نە هەواڵی دادگاییکردنی هەیە، کە لەگەڵ چەندان بانگخواز و زانایانی سعودی دی لە زیندانەکانی سعودییە بە شێوەی هەڕەمەکی و ڕەشبگیری دەستگیرکراون.

## • کاریگەری و زاڵبوونی قورئان

لە سەیرترین نهێنییەکانی قورئان و لەهەمووشیان زیاتر جێی سەرنجە، ئەو کاریگەرییە سەیرەیە کە دەروونەکان لەکاتی گوێگرتن بۆی ملکەچ دەبن.. (کاریگەری و زاڵبوونی قورئان) دیاردەیەك کە عەقڵ تێیدا دۆش داماوە.

کاتێك دەنگی قورئان خوێنێك لە ژوورێك دێت، ئارامییەك لە دەورووبەرت دەنیشێت. هەست دەکەی دڵەڕاوکێ ئەو شوێنە جێدەهێڵێت.. وەك ئەوەی هەموو شتەکانی دەورووبەرت بێ دەنگی هەڵبژێن.. وەك ئەوەی هەموو جوڵەیەك وەستابێت. شتێکی سەیر هەست پێ دەکەی بەڵام ناتوانی دەریببڕی.

بۆ نمونە کاتێك لە ژوورەکەتیت، دەنگی قورئان خوێنێك لە مۆبایلەکەت دێت، یاخود لەناو ئۆتۆمبێلەکەتیت دەنگی وێستگەی رادیۆکە چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزی حەرەمی پیرۆز پەخش دەکات.. هەست دەکەی بێدەنگی و ئارامییەکی سەیر وردە وردە لێت نزیك دەبێتەوە.

بۆ نمونە تۆ لە کارخانەیەك بیت، دەنگی ئامێر و مەکینەکان زۆربن، ناکاوکێك هەموو شتێك بوەستیت. وەك ئەوەی کارەبا لەو کارخانەیە ببڕێت و بێدەنگی و خامۆشییەك باڵ بەسەر شوێنەکەدا بگرێت.

ئەو دیاردە هەستپێکراوەی (قورئانی پیرۆز) لە دەروونەکان دروستی دەکات، زۆربەی خەڵك بە زمانێکی پڕ لە سەرنجڕاکێشی باسی دەکەن.

هەندێکجار لەوانەیە گەنجێك قسەت لەگەڵ بکات کە بێزارە لە دایك و باوکی، هەوڵ دەدەی هەندێ دەستەواژەی پەروەردەیی جوانی بۆ دابڕێژی بۆ ئەوەی قەناعەتی بۆ دروست بکەی کە پێویستە ڕێزیان بگرێت گەرچی هەر کارێکیشیان کردبێت.

دەبینی ئەو گەنجە گفتوگۆ و دەمەتەقێیکەی زیاتر دەکا، گەر هەموو ئەمانەت کرد بە یەك وشەت پێتگوت: ئەی برای بەرێزم خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ وَٱخۡفِضۡ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ

ٱلرَّحۡمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرۡحَمۡهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرٗا ﴾ الإسراء: ٢٤ واته "باڵی میهرەبانی خۆتیان بۆ ڕاخه و ملکەچ بە بۆیان، نزا بکە و بڵێ: پەروەردگارا رەحمیان پێ بکە و میهرەبان بە بۆیان، هەروەکو چۆن ئەوان رەحمیان بەمن کردوو و منیان پەروەردە کردووە بە بچووکی و منداڵی". دەبینی هەڵوێستی ئەو گەنجە بە تەواوی دەگۆڕێ و تەنانەت ئاوازی دەنگیشی دەگۆڕێ، ئەی خوایە چۆن ئەو ئایەتە جوڵاندی.

کاتێك بۆ یەکەمجار بەر لە سێ ساڵ بۆ خوێندن چومە کۆمەڵگای رۆژئاوایی، گرنگییەکی لەرادەبەدەرم بە چیرۆك و هەواڵی (ئەوانەی تازە بوونەتە ئیسلام) دەدا.

دەمویست تەنیا یەك پرسیار بدۆزمەوە:

ئەو شتەی زۆر کاریگەی هەبووە لە پاڵنانی مرۆڤی رۆژئاوایی بۆ هاتنە ناو ئیسلام چییە؟ (بۆ ئەوەی بتوانم لە بانگەوازی ئەوانی تر سوودی لێ ببینم).

پێشبینیم دەکرد لەبارەی ئەو بابەتە بگەم بە (بیرۆدۆزێکی ئاڵۆز)، یاخود وردەکاری زۆر کە خەڵکانێکی زۆر نایزانن، بۆ ئەو مەبەستە ئەزموونی کەسی رۆژئاوایی زۆرم خوێندەوە ئەوانەی ئیسلام بووبوون. سەیری گرتەی تۆمارکراوی زۆرێکم کردن کە چیرۆکی ئیسلامبوونیان دەگێڕایەوە، بینیم ئەو هۆکارەی کە زۆرترین جار لە چیرۆکەکانیان دووبارە بووەیە ئەوەبوو کە ئەوان (کاتێك گوێیان لە قورئان گرتووە هەستیان بە شتێکی سەیر کردووە کە زاڵبووە بەسەریان).

ئەم سیناریۆیە لە چیرۆکی زۆربەی ئەوانی ئیسلام بوو بوون دووبارە بۆتەوە، لە کاتێکدا ئەوان هیچ لە زمانی عەرەبی هەر نازانن!

ئەمە کاریگەریی و زاڵبوونی قورئانە.. خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ لَوۡ أَنزَلۡنَا هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ عَلَىٰ جَبَلٖ لَّرَأَيۡتَهُۥ خَٰشِعٗا مُّتَصَدِّعٗا مِّنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِۚ ﴾ الحشر: ٢١ واته "ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندایە سەر کەژ و کێوێك، دەتبینی ملکەچ دەبوو، ورد و خاش دەبوو، شەق و پەق دەبوو، لە ترسی

فەرمانی خوا، لە هەیبەتی گەورەیی و دەسەڵاتی خوا". ئەمە کاریگەرییە و زاڵبوونییەتی لەسەر بێ گیانەکان دەبی لەسەر مرۆڤ چی بێ؟

لە سەیرترین هەواڵی کاریگەرییەکانی قورئان، چیرۆکێکی بەناوبانگە بوخاری لە سەحیحەکەیدا دەیگێڕێتەوە، ڕووداوی چیرۆکەکە بەر لە کۆچی پێغەمبەر بووە، کاتێك ئازاردانی موسڵمانان زۆربوو نەوەی هاشیم و موتەڵیبیان گەمارۆدا، ئەوکات پێغەمبەری خوای ڕوخسەتی دایە هاوڵەکانی بۆ حەبەشە کۆچ بکەن. ئەبوبەکر بە مەبەستی کۆچکردن بۆ حەبەشە چووە دەرەوە، لە ڕێگادا مالیکی کوڕی حارس (إبن الدغنه) توشی بوو، ئەو سەرکردەی هۆزی (القارە) بوو، ئەو هۆزە هاوپەیمانیان لەگەڵ قوڕەیش هەبوو، بەڵێنی دا ئەبوبەکر بپارێزی بۆ ئەوەی لە مەککە خواکەی بپەرستێ، بەم شێوەیە بۆمان دەگێڕێتەوە:

(ئەبوبەکر لەو ماڵە دەستی بە خوا پەرستی کرد، لە هیچ شونێکی تر جگە لەماڵی ئەو کابرایە نوێژی بە ئاشکرا نەدەکرد، پاشان لەناو حەوشەی ماڵەکەی مزگەوتێکی بۆ ئەبوبەکر دروست کرد، ئەو کات ئەبوبەکر لەوێ نوێژی دەکرد و قورئانی دەخوێند، ئافرەت و منداڵی بێ باوەڕەکان (موشریکەکان) کۆمەڵیان لەسەر دەکرد و لەسەری کۆ دەبوونەوە، لایان سەیر بوو تەماشایان دەکرد، کە ئەبوبەکر پیاوی گریان بوو، لەکاتی قورئان خوێندن نەیدەتوانی فرمێسکەکانی خۆی بگرێت، ئەم چیرۆکە سەرکردەی قوڕەیشییەکانی لە موشریکەکان ترساند) {البخاری٢٢٩٧ }.

(کۆبوونەوەی ئافرەتان و منداڵی موشریکەکان) لەو دەستەواژانەیە کە دێتە ناو مێشکم، کاتێك گوێم لە قورئان دەبێ وەك ئەوەی بەرۆکی خەڵکەکە بگرێ و بۆلای خۆیانی ڕابکێشێ.

....

سەیرکە چۆن ئەبوبەکر لەکاتی خوێندنی قورئان خۆی پێ کۆنترۆڵ نەدەکرا و فرمێسکەکانی بەسەریدا زاڵ دەبوون.. سەیری خانەوادەکانی قوڕەیش بکە، کە چۆن دلڕەق و سەرکردە بەجەرگەکانی کافرەکان نەیانتوانی لەبەر گوێگرتنی قورئان هەڵبێن..

لە هەمووشتێکیش سەرسوڕێهنەرتر ئەوەیە کە خوای گەروە ئەو دیاردە مرۆڤایەتییەی بەرامبەر قورئان کرۆدتە بەڵگە، خوای گەورە هۆشیارمان دەکاتەوە کە سەرنج بدەین لەو کاریگەرییەی قورئان لەسەر دەروونەکان هەیەتی، بەو پێیەی لە گەورەترین بەڵگەکانی ئەو قورئانە (کاریگەرییەکەیەتی) کە سەرچاوەکانی دڵنیایی ئەو کتێبە پیرۆزەیە، قورئان تەنیا ئاماژە بە کاریگەرییەکی سادە ناکات، بەڵکو بابەتەکە لە هەندێك شوێندا دەگاتە چۆکدادان و سەرلەزوەوی نان..

ئایا هیچ کاریگەربوونێکی ویژدانی لەکەوتن بەسەر زەویدا بەهێزتر هەیە؟

لەگەڵ مندا بیر لەو دیمەنە سەرسورهێنەرە بکەوە کە خوای گەورە (جل وعلا) لەبارەی کاریگەری و زاڵبوونی قورئان لەسەر دەروونەکان بۆمان دەگێڕێتەوە ﴿ قُلْ ءَامِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوْ لَا تُؤْمِنُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا ﴾ الإسراء: ١٠٧ واتە" پێیان بڵێ: (ئەی خوانەناسان) باوەڕ بە قورئان بهێنن یان باوەڕی پێ نەهێنن (بەدەست خۆتانە و ئەمڕۆ سەربەستن، بەڵام بزانن) بەڕاستی ئەوانەی پێشتر زانیاریان پێدراوە (دەربارەی تەورات و ئینجیلی دەستکاری نەکراو، چاك دەزانن کە ئەم قورئانە لە هەمان سەرچاوەوەیە، هەر بۆیە) کاتێك بەسەریاندا دەخوێندرێتەوە (خۆیان پێناگیرێت) خێرا سەری ڕێز و نەوازشی بۆ دادەنەوێنن و سوژدە (بۆ نێرەرری قورئان دەبەن)".

بۆخاتری خوا، دووبارە ئەم ئایەتە بخوێننەوە، بیر لەو وێنەیە بکەوە کە ئایەتەکە بۆتی دەکێشێت: دەستەیەك هەندێك زانستیان لا هەیە، کاتێك کەمێك لە ئایەتەکانی قورئانیان بەسەردا دەخوێندرێتەوە، خۆیان بۆناگیرێت بەهۆی کاریگەربوونیان پێیەوە بە سوژدە بردن دەکەونە سەرزەوی..

چەند گەورەیە ئەم قورئانە..

بەڵکو گوێ بگرە لە حاڵی نەتەوە و دەستیەکی تر کە باشترن لەوانەی کە خوای گەورە لە ئایەتی پێشوودا باسی کردن..

گوێ لەو کارتێکردن و کاریگەربوونەی نەتەوەیەکی تر بگرە بە ئایەتەکانی سروش (وەحی)، خوای گەورە دەفەرمویێت: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنۡ حَمَلۡنَا مَعَ نُوحٖ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡرَٰٓءِيلَ وَمِمَّنۡ هَدَيۡنَا وَٱجۡتَبَيۡنَآۚ إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُ ٱلرَّحۡمَٰنِ خَرُّواْۤ سُجَّدٗاۤ وَبُكِيّٗا ۩ ﴾ مريم: ٥٨ واتە "ئا ئەوانە کەسانێکن کە خوای گەورە ناز و نیعمەتی بەسەردا رشتوون لە پێغەمبەران، لە نەوەی ئادەم و ئەوانەش (کە لە کەشتیەکەدا) لەگەڵ نوحدا سوارمان کردن و لە نەوەی ئیبراهیم و یەعقوب و لەوانەی کە هیدایەتمان داون و هەڵمان بژاردوون، ئەوانە، هەرکاتێك ئایەتەکانی خوای میهرەبانیان بەسەردا بخوێنرێتەوە، بە پەلە سوژدە دەبەن و ئەسرین لە دیدەیان دەبارێت، (لە سۆز و خۆشەویستی پەروەردگاریان دڵانی پر لە نوور و ئیمانیان دەکوڵێت و دەگرین".

ئەو ئایەتە وێنە و (جنس)ی پێغەمبەران دەگرێت..

نەك تەنیا پیاوێکی باش. ..

نەك نەتەوەیەك لەوانەی زانستیان هەبووە..

نەك نەتیا پێغەمبەرێك یان دووان

بەڵکو ئایەتەکە وێنەی (جۆری پێغەمبەران) دەکێشێت..

ئایەتەکە تەنیا باسی ئەدەبی گوێگرتن لە وەحی و کاریگەربوون پێی ناکات..

بەڵکو وێنەی پێغەمبەرانمان پیشان دەدات کە چۆن دەکەونە سەر زەوی و سوژدە دەبەن.. پێغەمبەران دەکەونە سەر زەوی و لەکاتی گوێگرتنیان لە وەحی دەست دەکەن بە گریان...

دەبێ ئەو وەحییە سەیرە چی لە دەروونیان کردبێت؟

هۆزێکی تر لەسەردەمی ئیسلامن کە خوای گەورە باسیان دەکات، وەك پیاهەڵگوتنێك و بەرزنرخاندینان لە وێنەیەکی پڕ جوانیدا باسیان دەکات ﴿ وَإِذَا سَمِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعۡيُنَهُمۡ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ ﴾ المائدة: ٨٣ واتە "ئەوانەیان کە بەشوێن راستیدا دەگەڕێن -هەر

کاتێك گوێیان لە قورئان دەبوو کە بۆ پێغەمبەر ﷺ دابەزیووە، دەبینیت چاوەکانیان ئەسرینی خۆشی هەڵدەڕێژێت".

هەر کەسێك ئەو ئایەتەی پێشوو بخوێنێتەوە، دەزانێت ئەوانەی ئەسرین لە چاوەکانیان دێت لە کاتی خوێندنەوەی قورئان بە هۆی شتێکەوەیە کە توانای خۆگرتنیان بەرامبەری نییە.

ئەو نهێنیەی لە قورئان دایە، هەر ئەوەیە لە کاتی گوێبیستبوونی فەرمایشتەکانی پەروەردگار فرمێسکەکان دەوروژێنێت و لە چاوەکانی دەرژێنێت.

بۆ چی فرمێسکەکانیان دەڕژێت؟ ئەمە نهێنی قورئانە.

ئەو دیاردەیەی لە کاتی گوێگرتینان بۆ قورئان دەست بەسەر مرۆڤدا دەگرێت، تەنیا بریتی نییە لە دەرەنجامێکی زانستی یان تێبینیکردنێکی دەروونی.. بەڵکو شتێکی ترە کە خوای گەورە هەواڵی پێداوین کە لەناو خودی قورئان دایناوە..

کارتێکردنی قورئان تەنیا لەسەر دەروون و دڵەکان نییە..

بەڵکو کاریگەری دەرەکیشی لەسەر ئەندامەکان هەیە..

ئەندامەکانی جەستە خۆیان لە کاتی گوێبیستوونی قورئان دەلەرزن و رادەچڵەکێن.

موچڕکە (تەزوو)یکی سەیر بەسەر جەستەی مرۆڤدا دێت لە کاتی گوێبیستبوونی قورئان وەك پەروەردەگار دەفەرموێت ﴿ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ ﴾ الزمر: ٢٣ واتە" خوا (الله) جوانترین و پیرۆزترین فەرمایشتی ناردۆتە خوارەوە کە ئەم قورئانەیە، (لە جوانی دارِشتندا) بابەتەکانی لە یەك دەچن، هەندێك باسیشی بەشێوازی جیاواز تیادا دووبارە بۆتەوە، جا کارکردی ئەم قورئانە ئەوەیەکە: تەزوو دەهێنێت بە گیان و پێستی ئەوکەسانەدا کە ترسی پەروەردگاریان لە دڵ و دەرووندا هەیە، پاشان گیان و پێست و دڵیان نەرم و ئامادە و چالاك دەبێت بۆ یادی خواو خواپەرستی"

سەرنج بدە چۆن قورئان قۆناغەکانی کارتێکردن و کاریگەربوونەکە وێنە دەکێشێت، موچڕکی پێست، پاشان نەرمبوونی، ئەمە ساتی بەریکەوتنە بە ئایەتەکانی پەروەردگار، لە دواتردا تەسلیم بوونی ئیمانی دێت، بەڵکو ئامادەسازییەکی دەستەمۆیی بۆ کڕۆکی ئایەتەکان دێت.

بۆیە هەرچەند بتوانی (وتاری سەرنجڕاکێش) لە شێوازی گفتوگۆکردن لەگەڵ خەڵکی و باوەڕپێهێنیان بەکاربهێنی ناتوانی بگەیتە ئاستی موچڕك و تەزووهێنان بەپێست، وەك لەیەکەم ڕووبەڕووبوونەوەی ئایەتەکان ڕوودەدات، پاشان پێست و دڵیان بۆ پەروەردگاریان نەرم دەبێت، بە ملکەچبوونێکی بێ مەرج، تەسلیم و دەستەمۆ دەبێت.

موسڵمان ئەم دیاردەیە لە هەڵسوکەوتی مرۆڤەکان بەرامبەری هەست پێدەکات.

تاقیکەرەوە، بۆ نمونە کەسێك پرسیارت لێ دەکا: پێی دەڵێیت ئەو مامەڵەیە بۆنی ریبای لێ دێت کە بەئیجماع حەرامە... لە هەڵوێستێکی تردا، ئایەتەکانی قورئانی تایبەت بە حەرامکردنی ریبا بۆ دێنێتەوە و پاشان حوکمی شەرعی بۆ ڕوون دەکەیەوە، ئینجا جیاوازی کاریگەری نێوان ئەو دوو هەڵوێستە لەسەر کەسی بەرامبەر دەبینی.

ئەمەش هۆگربوونی دەروون و دڵەکانە بۆ پەروەردگاریان کە قورئان دروستی دەکات وەك دەفەرموێت ﴿تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ﴾المزمر:٢٣

لەبەرامبەر ئەمەدا، کاتێك ئەهلی حەز و ئارەزووەکان دەبینی گوێ لە ئایەتەکانی قورئان دەگرن بەڵام پێی کاریگەر نابن، بۆ ناوەڕۆکی ملکەچ نابن، کاریان تێناکات، بەڵکو لەوانەیە لە خوێندنەوەی کتێبی هزری و گفتوگۆی فیکری چێژ وەربگرێ و زۆربەی تەمەنی تێدا سەرف بکات، ئەمەیان ئەو کەسەیە کە کتێبی خوای گەورەی جێهێشتووە، مانگێك، دووان، سێی مانگ دەڕوا، ئەو هیچ کاتێك لەگەڵ کتێبەکەی خوای گەورە دانانیشتێت بۆ ئەوەی تێی بفکرێت و بیری لێبکاتەوە و بەدوای ئەوەدا بگەڕێت کە خوای گەورە چی لە بەندەکانی دەوێت.. کاتێك ئەمەت هەموو بینی، ئینجا برای بەڕێزم سوپاسی خوای

گەورە بكە لەسەر سەلامەتیت، بیر لەو فەرمایشتەی خواش بكەرەوە ﴿ فَوَيْلٌ لِّلْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ اللَّهِ ﴾ الزمر: ٢٢ واتە "هاوار و وەیل بۆ ئەوانەی كە دڵیان ڕەقە لە ئاستی قورئان و یادی خوادا".

كاتێك خوای پەروەردگار سەركەوتووت دەكات، ڕۆژانە (حزبێك)ت لە كتێبی خوا بۆ دەبێت" وەك چۆن بۆ هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ حزبی ڕۆژانەیان لە قورئان هەبوو".

هەر كاتێكیش لە خوێندنی بەشی ڕۆژانەت تەواو دەبیت، هۆشیار بە ئەی برای بەڕێزم هەرگیز هەست بە نازكردن بەسەر خوای گەورەدا نەكەی بەوەی كە قورئانت خوێندووە، بەڵكو بە تەواوبوونی، خۆت بۆ پلەیەكی تری ئیمانی ببە، ئەویش هەستكردنە بە منەت و فەزڵی خوای گەرە لەسەرت، بەوەی ڕێزی لێناوی كە ئەم ماوە كەمەی لەگەڵ كتێبەكەی خۆیدا پێ بەخشیووی، گەر ئەو نیعمەتەی خوای گەورە لەسەرت نەبایا، ئەو چەند خولەكەش لەگەڵ كاتەكانی تر بێ سوود دەڕویشت، گەر نەفسی مرۆڤ لە دوای ئەنجامدانی كارێكی باش ئاوڕ لە چێژەكانی بداتەوە لە خوای پەروەردگار دوور دەكەوێتەوە، بەڵام گەر بۆ سوپاسكردنی خوای گەورە لەسەر ئەوەی كە یارمەتی داوە بۆ بەندایەتكردنی ئەوكات پلەكانی بەندایەتی بۆ لای خوای گەورە بەرز دەبێتەوە، وەك خوای گەورە بەو فەرمایشتەی ئاگادارمان دەكاتەوە ﴿ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا ﴾ النور: ٢١ واتە "ئەگەر فەزڵ و میهرەبانی خوا نەبوایە لەسەرتان ئەوە هەرگیز كەستان پاك و پوختە و ڕزگار نەدەبوو".. هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَانَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلَا أَنْ هَدَانَا اللَّهُ ﴾ الأعراف: ٤٣ واتە "هەمووان بەیەك دەنگ و یەك ئاواز) دەڵێن: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی كە هیدایەت و ڕێنموویی كردین بۆ ئەم جێگەو ڕێگە خۆشە، ئەگەر ئەو خوایە هیدایەت و ڕێنموویی نەكردینایە هەرگیز ڕێگای هیدایەتمان نەدەزانی و ئەم پاداشتەمان وەرنەدەگرت".

پاككردنەوەی دەروون، گەورەیی و ڕەحمەتێكی خوای میهرەبانە كە دەیداتە بەندەكانی، دوای ئەو بەندایەتیكردنە پێویستی بە بەندایەتیكردنێكی ترە ئەویش سوپاسگوزاریكردنە، بەشێوەیەكی وردتر

بڵێین، مرۆڤ لە دوای هەر بەندایەتیکردنێك پێویستی بە یەکێکی ترە، لە دوای ئەویش پێویستە بە یەکێکی ترە، ئەو بەر لەبەندایەتیکردنیش پێویستی بە بەندایەتیکردنی (پشتبەستن و داوای پشتیوانیکردن لە خوای گەورە - الاستعانە) هەیە، هەروەها دوای ئەویش پێیوستی بە بەندایەتیکردنی سوپاسگوزاریە.

هەر کەسێك نیەتی خۆی بۆ بەندایەتیکردن یەکلاکردەوە، ئامانجی ئەو نیەتەی دەکاتە پلاندانان و نەخشەڕێژی. لەبیری دەچیٚ کە هەموو ئەمانە تەنیا ئامڕازی لاوەکین، بەڵکو ئامڕازی راستەقینە (داواکردنی پشتیوانیە– الاستعانە)..

لەگەڵ ئەوەی داواکردنی پشتیوانی خۆی لەخۆیدا بەندایەتیکردنە، بەڵام خوای گەورەی لە دوای بەندایەتیکردن باسی کردووە ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾ الفاتحة: ٥ واتە "خوایە" تەنها هەر تۆ دەپەرستین و هەر لە تۆش داوای یارمەتی و پشتیوانی دەکەین". ئەو پشت بەخوا بەستنە گشتگیرە و هەموو شتێك دەگرێتەوە، لەسەرجەم خواپەرستییەکان، لەهەموو پرۆژە چاکسازییەکان، لە بەرگریکردن لەرێ لادانێکی شەرعی، لە وتاری بانگەوازی، هەرکەسێك داوای پشتیوانی لە خوا بکات و پەنای بۆ ببات، لەبەرامبەردا خوای گەورە دەرگاکانی سەرکەوتنی بە جوانترین و ئاسانترین شێوە بۆ دەکاتەوە کە خۆشی هەرگیز بیری بۆ ناچێت.

سەرباری ئەمە، ناکرێ تێبینی کاریگەرییەکانی قورئان لەسەر دەروون لە دەست خوێنەری قورئان دەربچێ، کە ئەویش لە راستیدا لە زمانی عەرەبی پێی دەوترێت (سطوة القرآن)، (سطوة) وەك ئیبن فارس دەڵێت" بریتییە لە زاڵبوون و دەسەڵاتی گەورە"، بێگومان قورئان زاڵبوون و دەسەڵاتی دیاری بەسەر دەروونەکانەوە هەیە، ئەمەیان هاوواتایی ئەو وەسفەیە کە خوای گەورە بە" إزهاق - لەناوچوون "لە قورئان ناوی دەبات وەك دەفەرموێت ﴿ وَقُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ ۚ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴾ الإسراء: ٨١ واتە " بڵێ: تازە ئیتر حەق و راستی هاتووە و بەرپا بووە و بەتاڵ و ناحەقی، پووچ و تەفرو توونا بووە، بەڕاستی ناحەق و بەتاڵ هەرتیاچووە و جێگیر نەبووە و بەزیووە".

هەروەها هاوواتای ئەوەیە کە خوای گەورە لە قورئان بە" الدمغ-داغان "وەسفی دەکات. ﴿ بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ فَيَدْمَغُهُ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ ﴾ الأنبياء: ١٨ واتە" بەڵکو حەق دەماڵێن بەسەر بەتاڵ و ناحەقیداو دەست بەجێ داغانی دەکەین".

هاوواتای وەسفی قورئانە بە "وردوخاشبوونی بوونەوەر" وەك دەفەرموێت ﴿ لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا الْقُرْآنَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ ﴾ الحشر: ٢١ واتە "ئەگەر ئەم قورئانەمان داببەزاندایە سەر کەژ و کێوێك، دەتبینی ملکەچ دەبوو، ورد و خاش دەبوو، شەق و پەق دەبوو، لە ترسی فەرمانی خوا، لە هەیبەتی گەورەیی و دەسەڵاتی خوا".

هەروەها هاوواتای وێچواندنی قورئانە بە "هەورە بروسکە" کە دەفەرموێت ﴿ يَكَادُ الْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَارَهُمْ ﴾ البقرة: ٢٠ واتە "خەریکە تیشکی بروسکەکە بینایی چاویان بەرێت". ئەم وێچواندنە ئیبن عەباس ڕەزای خوای لێبێت ئاماژەی پێداوە.

بۆ ڕاستی ئەم واتایە، لە زۆربەی کتێبەکانی پێشوو جۆرە وەسفێك بۆ قورئان دەبینی کە جەخت لە کاریگەرییەکانی لەسەر نەفس دەکەنەوە، وەك دەستەواژەی (زواجر القرآن) و دەستەواژەی (قوارع القرآن) چەندانی تر.

"السطوة" گەر بە واتای سزادان بێت، مەبەست لێی کارێکی لێوەشاوەیە بە خوای پەروەردگار، وەك لە هەندێ (أثر)دا هاتووە لە ئیبن حبان و کەسانی ترەوە دەگێڕێنەوە " إن الله إذا أنزل سطوته " واتا کاتێك خوای گەورە سزای خۆی دادەبەزێێت. ئەم واتایە لە هەندێك کتێبی تەفسیر وەك تەبەری و ئیبن کثیردا هاتووە وەك " يحذرهم الله سطوته " واتە خوای گەورە لە سزادانی خۆی ئاگاداریان دەکاتەوە.

خوایە گیان بمانکەیتە ئەهلی قورئان، خوایەگیان دڵەکانمان بە قورئان زیندوو بکەیتەوە، خوایە بمانکەیتە ئەو کەسانەی کە گوێیان لە قورئان دەبێت تەزوو بەلەشیان دا دێت و پاشان پیست و دڵیان بۆ فەرمایشتی تۆ نەرم دەبێت، خوایەگیان بمانکەیتە ئەو کەسەی گەر گوێ لەوەبێت کە دادەبەزێتە سەر نێردراوی تۆ چاوەکانی پڕ لە فرمێسك دەبن، خوایەگیان بمانکەیتە ئەو کەسەی گەر ئایەتەکانی" ڕەحمان"یان بەسەردا

بخوێندرێت بە سوژدە و گریان دەکەونە سەر زەوی. خوایە پەنا بەتۆ دەگرین و پەنا بۆ تۆ دەهێنین کە نەبینە ئەوانەی دڵیان لەبەرامبەر یادی تۆدا ڕەقە.. ئامین.

...............................................

- **بیر بکەرەوە.. بزانە چۆن سەرسام بوون..!!**

لێی ورد ببەوە و بیربکەرەوە چۆن (بێ گیانەکان) بە ئارامی و دڵنیایی و ئاسوودەیی قورئان کاریگەربوون ﴿ لَوۡ أَنزَلۡنَا هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ عَلَىٰ جَبَلٖ لَّرَأَيۡتَهُۥ خَٰشِعٗا مُّتَصَدِّعٗا مِّنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِ ﴾ الحشر: ٢١.

شاخە دامەزراوەکان ئەوانەی لەبەر رەقی و توندیان نمونەیان پێ دەهێندرێتەوە، بەرامبەر شکۆی فەرمایشتی خوادا وردوخاش دەبن. هەروەها سەیر بکە چۆن "ئافرەتانی بێ باوەڕ و منداڵەکانیان" بەرامبەر ئارامی و دڵنیایی قورئان هەناسەیان سوار دەبێ و سەرسام دەبن.

"لەناو حەوشەی ماڵەکەی مزگەوتێکی بۆ ئەبوبەکر دروست کرد، ئەو کات ئەبوبەکر لەوێ نوێژی دەکرد و قورئانی دەخوێند، ئافرەت و منداڵی موشریکەکان کۆمەڵیان لەسەر دەکرد و لەسەری کۆ دەبوونەوە، لایان سەیر بوو تەماشایان دەکرد، کە ئەبوبەکر پیاوی گریان بوو، لەکاتی قورئان خوێندن نەیدەتوانی فرمێسکەکانی خۆی بگرێت، ئەم چیرۆکەیان سەرکردەی قورەیشییەکانی لە موشریکەکان ترساند) {البخاري:٢٢٩٧ }.

سەیربکە چۆن "گەورەکانی موشریکەکان" بە ئاسودەیی و ئارامی قورئان سەرسام بوون، لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە، جوبیەری کوڕی مطعم هاتە لای پێغەمبەرﷺ ویستی لەبارەی بەندکراوەکانی بەدر دانوستانی لەگەڵ بکات، کاتێك گەیشتە لای پێغەمبەر بینی موسڵمانان لە نوێژی مەغریب دان، پێغەمبەر پێشنوێژی بۆ دەکردن، جوبەیر گوێی لە خوێندنەوەی پێغەمبەر بوو. با گوێبگرین کە جوبەیر خۆی بۆمان باس دەکا چۆن ئارامی و دڵنیایی قورئان هەست و سۆزی بردووە، جوبەیری کوڕی مطعم دەڵێت:

"گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو لە نوێژی مەغریب سوڕەتی (الطور)ی دەخوێند، کاتێك گەیشتە ئەو ئایەتەی ﴿ أَمۡ خُلِقُواْ مِنۡ غَيۡرِ شَيۡءٍ أَمۡ هُمُ ٱلۡخَٰلِقُونَ ۝٣٥ أَمۡ خَلَقُواْ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ

﴿٣٦﴾ أَمۡ عِندَهُمۡ خَزَآئِنُ رَبِّكَ أَمۡ هُمُ ٱلۡمُصَيۡطِرُونَ ﴾ الطور: ٣٥ - ٣٧ خەریك بوو دڵم دەفڕی "
{البخاري:٤٨٥٤}

تەفسیرە کوردییەکەی ئەم چەند ئایەتە: "ئایا ئەوان بە بێ هیچ هۆیەك هاتونەتە کایەوە؟ یان هەر خۆیان دروستکارن؟ یان ئەو بێ باوەڕانە ئاسمانەکان و زەوییان دروستکردووە؟ نەخێر ئەوان هەوان هەر دڵنیا نابن. یان ئەوەیە گەنجینەی رزق و رۆزیەکانی پەروەردگاری تۆیان بەدەستە؟! ئان ئەوەیە دەسەڵاتیان بێ بێ سنوورە؟"

چەند جوانە دەربڕینی عەرەب.. بەمشێوەیە جوبەیر هەست و سۆزی خۆی لەکاتی گوێبیستبوونی سورەتی (الطور) دەردەبڕێت، لە ساتی توندبوونی دوژمنایەتی لەدوای ماندووبوونی جەنگ، ئەو بێ باوەڕە ئەو قسەیە دەکات، کاتێك دەیەوێت بەندکراوەکانی جەنگ وەربگرێتەوە، مرۆڤ لەو کاتەنەدا خۆی لە چوونە ژێرکاریگەری کەسی رکابەری بەدووردەگرێت، بەڵام ئارامی و هێمنی رایچڵەکاند تا ئەوەی خەریك بوو دڵی بفڕێنێ.

سەیربکە، چۆن دروستکراوە نادیارەکان (جنۆکەکان - پەرییەکان) بە ئاسودەیی و ئارامی قورئان سەرسام بوون، کاتێك پێغەمبەر ﷺ لە شوێنێك بوو پێیان دەگوت (بطن نخلة) نوێژی بەیانی بە هاوەڵەکانی دەکرد، خوای گەورە کۆمەڵە پەرییەکی بۆ ئامادەکردن ئەو کۆمەڵەیە پێیان دەگوترا (پەریەکانی ئەهلی نصیبین)، لە پێغەمبەر و هاوەڵەکانی نزیك بوونەوە، کاتێکیان گوێیان لە قورئان بوو بەدەنگی پێغەمبەر، ئەوسا بە ئاسودەیی و ئارامی قورئان سەرسام بوون، یەکتریان رادەسپارد گوێ لە قورئان بگرن، وەك پەروەردگار دەفەرموێت ﴿ وَإِذۡ صَرَفۡنَآ إِلَيۡكَ نَفَرٗا مِّنَ ٱلۡجِنِّ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓاْ أَنصِتُواْۖ ﴾ الأحقاف: ٢٩ واتە" یادی ئەوە بکە کاتێك ئێمە دەستەیەك پەریمان لادایە لای تۆ، تا گوێ لە قورئان بگرن، ئەوسا ئامادەبوون و بەیەکتریان وت: گوێ بگرن و بێ دەنگ بن".

لە شوێنێکی تر خوای گەورە باسی ئەو سەرسوڕمانیەمان بۆ دەکات کە باڵی بەسەر کۆمەڵێك پەری کێشا، دەفەرموێت ﴿ قُلۡ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ ٱسۡتَمَعَ نَفَرٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ فَقَالُوٓاْ إِنَّا سَمِعۡنَا قُرۡءَانًا عَجَبٗا ﴾ الجن: ١ واتە "ئەی

محەمەد ﷺ پێیان بڵێ: وەحی و نیگام پێڕاگەیەنراوە کە بەراستی دەستەیەك لە پەریان گوێیان گرتووە بۆ خوێندنەوەی قورئان و جا کە تەواو بووە وتویانە: بەڕاستی ئێمە خوێندنەوەیەکی سەرسوڕهێنەرمان بیست" .

ئەمجارەیان سەیربکە چۆن (مرۆڤە باشەکان) بە ئاسودەیی و ئارامی قورئان سەرسام بوون، شوێنەواری شکۆی قورئان تەنیا لەسەر دڵەکانیان ناوەستێت، بەڵکو دەگاتە سەر پێستیان کە بە کاریگەی قورئان گرژ دەبێت، وەکو دەفەرمویت﴿ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ ﴾.

هەروەها بڕوانە چۆن (مرۆڤەباشەکانی ئەهلی کیتاب) بە ئاسودەیی و ئارامی قورئان سەرسام بوونە، قورئان وێنەیەکی زۆر جوانی ئەوانمان بۆ دەکێشێت، کاتێك گوێیان لە قورئان دەبێت، فرمێسك لە چاوەکانیان دێت، کەسی تەماشاکار ئەو فرمێسکانە دەبینێت لە چاوەکانیان بریسکە دەداتەوە، وەك دەفەرمویت] ﴿ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةٗ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقۡرَبَهُم مَّوَدَّةٗ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنۡهُمۡ قِسِّيسِينَ وَرُهۡبَانٗا وَأَنَّهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ٨٢ وَإِذَا سَمِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعۡيُنَهُمۡ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ ﴾ المائدة: ٨٢ - ٨٣ واتە "سوێند بێت بەخوا دەبینیت و دەستت دەکەوێت نزیکترینیان لە سۆز و خۆشەویستی بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە ئەوانەن کە دەیانوت: بەڕاستی ئێمە نەصرانین، ئەوەش لەبەر ئەوەیە بەڕاستی هەندێك لەوان قەشەی دیندارن و هەندێکیشیان گۆشەگیرو کەسانی خواپەرستن و بێگومان ئەوان خۆ بەگەورە دانانێن، (ئەوانەیان کە بەشوێن راستیدا دەگەڕێن) هەر کاتێك گوێیان لە قورئان دەبوو کە بۆ پێغەمبەرﷺ دابەزیووە، دەبینیت چاوەکانیان ئەسرینی خۆشی هەڵدەڕێژێت".

ئەمجارەیان سەیرکە چۆن فریشتە رێزدارەکان بە ئاسودەیی و ئارامی قورئان سەرسام بوون، کاتێك گوێیان لە هاوەڵێك دەبێ بە دەنگێکی خۆش لەناوەڕاستی شەو قورئان دەخوێنێت، ئەوسا بە ئاسمانەکان رەت دەبن و لە زەوی نزیك دەبنەوە، وەك لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە، ئوسەیدی کوڕی حوزەیر دەفەرموێت: "کاتیك لەشەودا سورەتی (البقرە)م دەخوێند، سەرم بۆ ئاسمان بەرزکردەوە، هەستم کرد پارچەیەك لە سیبەر لە نمونەی روناکی و ئەستێرە لە ئاسمان هەیە، دەرچوومە دەرێ بۆ ئەوەی ببینم، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: تۆ دەزانی ئەمە چییە؟ گوتم: نەخێر.. پێغەمبەر فەرمووی: ئەمانە فریشتەکان بوون بەهۆی دەنگی تۆ نزیك بوونەوە، گەر بەردەوام بوویتایە، بەیانی خەڵك دەیانتوانی بەچاوی خۆیان بیانبینن و بزر نەدەبوون "{البخاری:٥٠١٨}.

سەیرکە چۆن پێغەمبەران (درودی خوایان لەسەربێت) بەرامبەر ئاسوودەیی و ئارامی وەحی سەرسام بوون، وەك چۆن قورئان کاریگەربوونیان بە فەرمایشتی پەروەردەگار لە کەوتنەسەرزەویان و گریانیانمان بۆ تۆمار دەکا، دەفەرموێت ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنۡ حَمَلۡنَا مَعَ نُوحٖ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡرَٰٓءِيلَ وَمِمَّنۡ هَدَيۡنَا وَٱجۡتَبَيۡنَآۚ إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُ ٱلرَّحۡمَٰنِ خَرُّواْۤ سُجَّدٗاۤ وَبُكِيّٗا ۩ ﴾ مریم: ٥٨ واتە "ئا ئەوانە کەسانێکن کە خوای گەورە نازو نیعمەتی بەسەردا رشتوون لە پێغەمبەران، لە نەوەی ئادەم و ئەوانەش (کە لە کەشتیەکەدا) لەگەڵ نوحدا سوارمان کردن و لە نەوەی ئیبراهیم و یەعقوب و لەوانەی کە هیدایەتمان داون و هەڵمان بژاردوون، ئەوانە، هەرکاتێك ئایەتەکانی خوای میهرەبانیان بەسەردا بخوێنرێتەوە، بە پەلە سوژدە دەبەن و ئەسرین لە دیدەیان دەبارێت، (لە سۆز و خۆشەویستی پەروەردگاریان دڵانی پر لە نوورو ئیمانیان دەکولێت) و دەگرین".

لە کۆتاییدا بڕوانە بزانە چۆن شەرفمەندترین دروستکراو و گەورەی نەوەکانی ئادەم (محەمەد درودی خوای لەسەر بێت) بە ئاسوودەیی و ئارامی قورئان سەرسام بووە، لە بوخاریدا عەبدوڵای کوڕی مەسعود بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت:

"پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: لەسەرم بخوێنەوە، وتم لەسەر تۆی بخوێنمەوە ئەی پێغەمبەری خوا، لەکاتێکدا بەسەرتۆدا دابەزیووە؟ پێغەمبەر فەرمووی: من حەز دەکەم لە کەسێکی ترەوە گوێم لێ بێت. ئینجا سورەتی (النساء )م بۆ خوێندەوە و تا گەیشتمە ئەو ئایەتەی ﴿ فَكَيۡفَ إِذَا جِئۡنَا مِن كُلِّ أُمَّةِۭ بِشَهِيدٖ وَجِئۡنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدٗا ﴾ النساء: ٤١ پێغەمبەر فەرمووی: بەسە. بینیم چاوەکانی فرمێسکیان لێ دەباری "{البخاري:٥٠٥٠}.

واتەی ئایەتەکە: " ئینجا دەبێت حاڵی ئەو خەڵکە چۆن بێت کاتێك لەهەر میللەتێك شایەتێکمان هێنا و تۆشمان هێنا (ئەی محمد ﷺ) بە شاهێد بەسەر ئەو خەڵکەوە (کە پەیامی خوات پێڕاگەیاندوون).

ئای لە نهێنی قورئان...

ئای لەم شکۆمەندی و هەیبەتییە قورئانییە، کە دەنیشێتە سەر دەروونی مرۆڤ و ملکەچ و گوێڕایەڵی دەکات بۆ فەرمایشتی خوا، فرمێسك دەهێنێتە چاو و گریان دەهێنێتە قوڕگ..

بەم شێوەیە.. بێ گیانە دامەزراوەکان وردوخاش دەبن، ئافرەتان و منداڵانی بێ باوەڕەکان بە نهێنی هەڵپەی گوێگرتنی قورئان دەکەن، سەرکردە بەجەرگەکان دێن دانوستان لەبارەی جەنگ بکەن لەگەڵ ئەوەشدا (دڵیان خەریکە بفڕێت)، پەرییەکان گوێ لە قورئان دەگرن و دەگەڕێنەوە ناو قەومەکەیان و هۆشداریان پێدەدەن، ئەو باوەڕدارانەی لەخوا دەترسێتن تەزوو بە پێستیان دادێت، قەشە راستگۆکان چاویان لەبەرامبەریدا پڕ لە فرمێسك دەبێت، فریشتە بەڕێزەکان لە ئاسمانەکانەوە دێن و وەك ئەستێرە دەدرەوشێنەوە و لە خوێنەرێکی دەنگخۆشی سوڕەتی (البقرە) لەناوەڕاستی شەو نزیك دەبنەوە، پێغەمبەران لەنەوەکانی ئادەم کاتێك گوێبیستی فەرمایشتی خوا دەبن بە سوژدە و گریان دەکەونە سەر زەوی، پێغەمبەری نازداریش ﷺ کاتێك گوێ لە چەند ئایەتێك دەبێت کە گۆڕەپانی مەحشەر و ساتی شاهێدی دان لەسەر خەڵك وێنە دەگرێت، ئەو کاتە لەبەر زۆری گریان هاوەڵەکەی خۆی لە خوێندنەوە دەوەستێنێت.

ئەی خوایە....

چەند گەورەیە فەرمایشتەکانت..

چەند جوانە کتێبەکەت..

کتێبێك ئەمە پێگەکەی بێت، ئەمە شوێنکەوتە و کاریگەرییەکەی بێت، ئایا شایستەیە برای شیرینم پشتگوێی بخەین؟ ئایا شایستەیە رۆژانە دەیان لێدوان و هەواڵ و ئیمەیل و بابەت بخوێنینەوە بەڵام کتێبەکەی خوای گەورە بەشی لەو خوێندنەی رۆژانەمان نەبێت؟

ئایا کتێبی مرۆڤەکان لە کتێبی خوای پەروەردگار گەورەترە؟

ئایا قسەی دروستکراوەکان لە فەرمایشتی دروستکار گەورەترە؟

ئایا بەسەرهاتی چیرۆکخوێنەکان لە چیرۆکی قورئان گەورەترە؟

بەراستی پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵای خۆی لەسەر بێ باوەڕەکانی ئومەتەکەی دەگەێنێتە لای پەروەردگار، کاتێك دەکەونە ناو سیفەتێکی ناشرین، ئەی هاوار بە حاڵمان گەر لەو سیفەتەی کە پێغەمبەر بێزاری خۆی بەرامبەر دەردەبڕێت ئێمە بە بێ باوەڕەکان بچین، سکاڵای خۆی بە پارانەوە دەگەێنێتە لای پەروەردگاری، لە سکاڵاکەی دەفەرموێت ﴿ وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَٰرَبِّ إِنَّ قَوۡمِي ٱتَّخَذُواْ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ مَهۡجُورٗا ﴾ الفرقان: ٣٠ واتە"پەروەردگارا بەڕاستی قەومەکەم وازیان لەم قورئانە هێناوە و پشت گوێیان خستووە و گرنگی پێ نادەن".

ئای لەو زیانە گەورەیە..

ئای لەو بێ بەشبوونە..

تەمبەڵی و سستی لەگەڵ مرۆڤ بێت، تا فڕێی دەداتە چاڵی (جێهیشتن و وازهێنان لە قورئان).. دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ کە خوشەویستمانە و نەفس و روح و ماڵ و هەرچی هەمانە دەیکەینە قوربانی ئەو، بەهۆی (جێهێشتنی قورئان)ی بێ باوەڕەکان سکاڵای خۆی دەگەێنێتە پەروەردگار.

ئایا بۆ خۆمان رازی دەبین پێچەوانەی مەبەست و ویستی خۆشەویستمان پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسوکەوت بکەین؟

ئایا بۆ خۆمان رازی دەبین کە بچینە ئەو بازنەیەی کە پێغەمبەر خوا ﷺ ئازار دەدات؟ کوا ڕێزگرتنمان بۆ پێغەمبەرەکەمان؟

براکەم، خوشکەکەم، ئەوەی بۆخۆم پێم خۆشە بۆتۆش پێم خۆشە..

بابەتەکە زۆر لەسەرمان ناکەوێت، بەڵکو چەند خولەکێکی دیاریکراوی ڕۆژانەمانە کە بیکەینە مافی پارێزراوی کتێبی خوای گەورە.

لە نێوان ئامۆژگاری و حوکم و هەواڵ چیرۆکەکانی کتێبەکە بگەڕێین، لە کانیاوی ئیمانیی و لە کانیاوی پابەندبوونی ئەرکی و ڕەفتاریی کە لە ئایەتە پیرۆزەکانی دادەبارێن خۆمانی پێ پاك بکەینەوە. کە پەیامێکی جیهانییە بۆ گشت مرۆڤ.

..............................................................

## • پلە و پایەی ئەشعرییەکان:

یەکێك لە نزیکەکانم پێش نزیکەی پازدە ساڵ ڕووداوێکی بۆ باس کردم..

بە درێژی بۆی گێڕامەوە، بەڵام ئەو کات زۆر گرنگیم پێ نەدا، بەڵام چیرۆکەکەی ناوەناوە لە مێشکم دێت و دەچێت، لە دەڤەری (عالیە نجد) کەسێکی گوندی لە گوندێکی سەرسنور نیشتەجێ دەبێت، بۆی گێڕامەوە گوتی، شەوێك ئامێری ساردکەرەوە دادەخات و لە نزیك پەنجەرە دەخەوێت، لە ڕێگەی دەنگی پیرەپیاوێکی گوندی کە شەو دەچێتە مزگەوت، وادەی سێیەکی کۆتایی شەو دەزانێت، لەپەنایەکی مزگەوت، بەرماڵە درێژەکەی ڕادەخات و بە شێوازی خۆی وەك پیرەپیاوێکی بەساڵاچوو دەستدەکات بە خوێندنی قورئان لە نوێژدا..

هەموو شەوێك ئەمە عادەتی بوو..

لەو کاتەوەی ئەو گوندییە بۆمی گێڕاوەتەوە، دڵم بۆ ئەو پیرەپیاوە دەجوڵێت بۆ ئەوەی نوێژە ڕۆحانییەکەی ببینم. خۆزگە دەمدیت، کاتێك دەست بە ڕیشی دادێنێت و قورئانیش دەخوێنێت.

خەریکە هەموو دڵی من دەبات..

ئەو خوێندنی بە تەجویدی ڕەوان نەبووە، تەنانەت بە دەنگێکی خۆشیش نەبووە، بەڵام -بە عزەتی خوای گەورە - ڕاستی و یەقینی تێدابووە، هەست دەکەم لە کاتی خوێندیدا بازنەیەکی پڕ نوور لە دەوریدا هەبووە.

ڕاستە قورئان بەگشتی هێزێکی کاریگەر هەڵدەگریت کە دڵی گوێگر بۆخۆی دەڕفێنێت.

بەڵام شتێکی تر هەیە کە بەم دواییانە هەستم پێکردووە.

ئەویش ئەوەیە، گەر خامۆشی باڵ بەسەر شەودا بگرێت، ئەو کات قورئان جیهانێکی ترە، ئەمەش بەهایەکی ترە لە گەورەیی و شکۆیی قورئان لە ساتی خامۆشی شەودا.

ئەو پیرەپیاوە قورئانییە چەند ساڵێکی کەمە کۆچی دوایی کردووە، ڕەحمەتی خوای لێبێت، بەڵام چی وایکرد چیرۆکەکەی لە گۆڕدا بێتەوە مێشکی من؟

لە ڕاستیدا ئەوەی ئەم چیرۆکەی زیندووکردەوە، بوونی چیرۆکێکی تری هاوشێوەیە کە لە سەحیحی بوخاریدا هاتە بەرچاوم، من دڵنیام کاتێك ئەم چیرۆکەت لە بوخاریدا خوێندەوە چاوەکانت لە دیتنی پەیوەندی ئاشکرای نێوان هەردوو چیرۆك هەڵە ناکات.

بوخاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێت:

"من دەنگی هاوەڵی ئەشعرییەکان لە قورئان دەناسم، کاتێك دەچنە شەو، بە دەنگی قورئانی شەوانەیان شوێنی مانەوەی شەوایان دەناسم، گەرچی من پێگەو شوێنی ئەوان بە ڕۆژ نابینم کاتێك دێنەدەر ."{البخاری:٤٢٣٢}

سەرنج بدە، بزانە چۆن پێغەمبەر بە ڕۆژ پێگە و شوێنی ئەوان نابینێت، بەڵام پێگە و شوێنیان لە کاتی خامۆشی شەودا، ئەو کاتەی دەنگی نەرمی قورئانخوێنانی دەگاتیَ دەبینێت، ئەمە" پێگەی ئەشعرییەکانە".

بۆ خاتری خوا.. ئایا لە وشەکانی پێغەمبەرﷺ ، گەرمی سەرسامبوون بەو خوێندنەوەی شەوانە لە ماڵەکانیان دێتەدەر هەست پێ ناکەی؟ !ئەمە ڕوونە کە پێغەمبەر ﷺ بە ڕێکەوت گوێی لەو خوێندنە شەوانە نەبووە، بەڵکو هەست دەکەی چۆن ئەو ﷺ کاریگەربووە بەو دەنگە جوانەی قورئان بە ئەندازەیەك کە بەدوای سەرچاوەی دەنگەکە چووە و پێگەی شەوانەی دیاریکردووە و بە ڕۆژیش هەواڵی ئەوانی داوە.

ئایا باوەڕ دەکەی من هەست بە خۆشەویستییەکی لەڕادەبەدەر دەکەم بۆ ئەو (ئەشعەریانەی) کە دەنگی قورئانی شەوانەیان سەرسامی پێغەمبەر ﷺ دەوروژاند. بەڵکو ئەو خۆشەویستییە پاڵی نام بۆ ئەوەی لە کتێبەکانی مێژوو و سیرەدا بەدوای هەواڵیاندا بگەڕێم.

ڕاستە هەندێك گەورەیی ئەوانم بۆ دەرکەوت، بەڵام تا ئێستا لە هەواڵی ئەوان دڵم ئاوی نەخواردۆتەوە، لە هەواڵی شەوانەیان، کە شەونخونیان لەگەڵ کتێببی پەروەردگار کردووە.

خوایەگیان لە ئەشعرییەکان خۆش بیت...

پێغەمبەر ﷺ بەردەوام گوێبیستی قورئان دەبوو بە ڕۆژ، بۆچی خوێندنی ئەشعرییەکان سەرنجی ئەوی ڕاکێشاوە و ئاوڕ لە پێگەی ئەوان دەداتەوە؟نازانم...

بەڵام من وای بۆ دەچم کە ئەمە نهێنی قورئان بێت بە شەوانە. ئایەتەکانی قورئان گەر دابەزینە سەر هەوری ئاسمان، ئەو کات بە ڕۆحانیەتێکی تایبەت دەردەچن.

دەرچوونی دەنگی قورئانخوێن لە نێوان شەپۆلەکانی شەوی خامۆشدا چیرۆکێکە نەفسەکان بۆی دەچەمێننەوە.

تێبینی چەند ڕووداوێکی ترم کردووە، کە سەرنجی پەرۆشی پێغەمبەر بەرامبەر دەنگی قورئانی شەوانە ڕادەکێشن.. لە سەحیحی ئیمام موسلیمدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ جارێکیان بە ئەبو موسای ئەشعەری فەرموو "لو رأيتني وأنا أستمع لقراءتك البارحة"{مسلم:١٨٨٧}، واتە: گەر منت دەبینی کاتێك دوێنی گوێبیستی قورئاخوێندنەکەت بووم.

پێدەچێت پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك گوێی لە قورئانخوێنێك دەبێت لە ناوەڕاستی شەوی تاریکدا قورئان دەخوێنێت، گرنگی زۆری بەسەرچاوەی دەنگەکە بدات.. تا ئەو ئەندازەیەی گەر بەیانی داهاتبایە دەچوو لای خاوەنی دەنگەکە و هەواڵی ئەمەی پێدەدا.

فەرموودەکەی" لو رأيتني وأنا أستمع"، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر بایەخی بە بابەتەکە داوە و گوێی بۆ گرتووە.

لەگەڵ من بیربکەرەوە ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ کە بە پشتیوانی خوای گەورە قورئانی لەبەر کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا بە بایەخەوە گوێ لەسەرچاوەی دەنگی قورئان دەگرێت، پاشان خاوەنی دەنگەکەش ئاگادار دەکاتەوە..

بۆچی..؟؟

ئەمە نهێنییە ڕۆحانییەکەی قورئانە، کاتێك باڵ بەسەر خامۆشی شەوی تاریکدا دەگرێت..

نەك تەنیا مرۆڤ.. بەڵکو فریشتەکانیش کاتێك دەنگی قورئانی هاوەڵێك دێت، لەنادیاری خۆیان دەردەچن، لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە ئوسیەدی کوڕی حضیر دەڵێت "بينما هو يقرأ من الليل سورة

البقرة، فرفعت رأسي إلى السماء، فإذا مثل الظلة فيها أماثل المصابيح، فخرجت حتى لا أراها، قال رسول الله: وتدري ما ذاك؟ قال: لا قال رسول الله: تلك الملائكة دنت لصوتك ولو قرأت لأصبحت ينظر الناس إليها لا تتوارى منهم" {البخاري٥٠١٨ }.

هەر کاتێك گوێم لە خوێنەرێکی قورئان دەبێت سورەتی (البقرە) دەخوێنێت، چەند بابەتێکی سەرنجڕاکێش بۆ مێشکی مرۆڤ دێنە بەرچاوم، لە (البقرە)دا چەند بابەتێك هەن کە دەروونی مرۆڤ رادەچڵەکێنن، لەهەموویان گرنگتر ئایەتی (الکرسی)یە کە هەمووی بریتییە لە وەسفی جوانی پەروەردگار، چیرۆکی تاقیکردنەوەی ئیبراهیم بە چەند فەرمان و بڕیارێك و پێشەوایەتی لە دیندا، چیرۆکی دەسەڵاتدارانی بەنی ئیسرائیل ئەوانەی داوای شەڕیان کرد، پاشان قۆناغ دوای قۆناغ پاشگەزدەبوونەوە. چەندان بابەتی سەرسوڕهێنەری تر.

مەبەستم لێرەدا ئەوەیە هەرکاتێك گوێم لە قورئاخوێنێك دەبێت سوڕەتی (البقرە) دەخوێنێت، هاتنە خوارەوەی فریشتەکان بە نوری خۆیان دێتەوە بیرم. وەك ئەو کاتەی لە خوێندنی ئوسیەدی کوڕی حضیر بۆ سوڕەتی (البقرە) لە ناوەڕاستی تاریکی شەودا هاتنە خوارەوە.

بۆچی فریشتەکان دابەزین، وەك ئەوەی ئەستێرە بن کە دەدرەوشێنەوە لە نادیاری خۆیان هاتنەدەر؟

ئەمانە سەرسوڕهێنەرەکانی کێتبی پەروەردگارن، کاتێك باڵ بەسەرخامۆشی شەودا دەگرێت.

بەڵکو بیر لە هەواڵێکی سەیرتر لەمە بکەرەوە، کاتێك پێغەمبەر ﷺ بە هەموو شێوەیەك– راستەوخۆ و ناراستەوخۆ -هاوەڵەکانی لە خوێندنی شەوانەی قورئان هان دەدا.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە میانەی گفتوگۆکردنی لەگەڵ هاوەڵەکانی پەیامی بۆ دەناردن بۆ ئەوەی خوێندنی قورئانی دوای هاتنی ئێوارە لە دڵیان بچێنیٚ.

یەکێك لەو چیرۆکانەی جارێکیان لە مەجلیسی پێغەمبەر ﷺ باس کرا، چیرۆکی هاوەڵی بەڕێز "شريح الحضرمي " بوو، پێغەمبەر ﷺ بە شێوازێکی زۆر روون ستایشی کرد، النسائی و هەندێکی تریش بە سەندێکی سەحیحەوە دەگێڕنەوە "أن شريحاً الحضرمي ذُكِر عند الرسول الله ﷺ فقال رسول الله: ذاك

الرجل لا يتوسد القرآن" {النسائی٣/٢٥٦ } واتە: باسی (شورەیح) لای پێغەمبەر ﷺ کرا، ئەویش فەرمووی: ئەو پیاوەی کە سەرناخاتە سەر قورئان (قورئان ناکاتە سەرین)؟

با بۆت روون بکەوە، کە یەکەمجار ئەو فەرموودەیەم خوێندەوە، مەبەستی " لا یتوسد القران" لام روون نەبوو؟

ئایا کەس هەیە، خوانەخواستە قورئان بکاتە سەرین (بالیف)؟

کەواتە واتای وایە ئەو کەسە بەشەو ناخەوێت کە خوێندنی بەشێکی قورئان جێبهێڵێت. بەڵام ڕەوانبێژی پێغەمبەر (البلاغة النبوية) بەو شێوەیە وێنای کردووە کە هەر کەسێك دوور لە قورئان بخەوێت وەك ئەوەیە کە قورئانی کردبێتە سەرینی.

دەقی فەرموودەکە دوو رووی هەیە، یان ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ ستایشی ئەو کەسە دەکە قورئان ناکاتە سەرین، یاخود سەرزەنشتی ئەو کەسە دەکات کە قورئان دەکات سەرینی، (ابن الجوزی) لە کتێبەکەی (الغريب) و (السندی) لە حاشیەکەی رووی یەکەمیان پێ ڕاستترە، لەسەر هەردوو مەزەندەکان ئەنجام ئاگادارکردنەوەکەی پێغەمبەرە بەو ڕێگا ڕەوانبێژە جوانە لەبارەی پلەوپایەی خوێندنەوەی قورئان لە شەوانەدا.

گەر پێغەمبەر ﷺ نوستن لەنەخوێندنی قورئانی لە شێوەی" سەرین"ی چواندبێ، پێدەچێت، سەرینی ئێمە لەبەر زۆر لەسەر خەوتنی شڕ بووبێت!

خوایە گیان ڕەحم بە حاڵمان بکەی، نەمانکەیتە ئەوانەی قورئان دەکەن سەرین.

لە کتێبی خوای گەورەدا ئاماژەی جوان هەیە بۆ خوێندنەوەی شەوانەی قورئان. لەوانە خوای گەورە ستایشی دەستەیەك دەکات لەسەر ئەم کارەیان کە دەفەرموێت ﴿ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتۡلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيۡلِ ﴾ آل عمران: ١١٣ واتە "دەستەیەك لە ئیمانداران هەن، ئایەتەکانی خوا لەکاتەکانی شەودا دەخوێننەوە".

ئایا دەتوانی رێ لەو هەستە بگریت، کاتێك بیر لەو دەستەیە دەکەیەوە کە خوای گەورە بەهۆی خوێندنی قورئانەوە خۆشی دەوێن، لەوساتەی خەڵك لەسەر جێگاکانیان نوستوون؟

خوای گەورە هەڵوێستی ئەوان بەرز دەنرخێنێت و لە کتێبە پیرۆزەکەی خۆی بە زیندووی دەیهێڵێتەوە.

دەستم کرد بە بیرکردنەوە لەو هەواڵە قورئانیانەی تیایدا گەورەیی قورئان لەشەو دەردەخەن، پرسیارم دەکرد: دەبێ هۆکاری ئەمە چی بێت؟

ئایا تەفسیرێکی زانستی بۆ ئەمە هەیە؟ نەگەیشتمە دەرەنجامێکی یەکلاکەرەوە، بەڵام هەندێ ئاماژەم لە کتێبەکەی پەروەردگار بۆ دەرکەوت.

قورئان لە چەند شوێنێك باس لە شەو دەکات کە شوێنی ئارامی و هێمنی و خامۆشییە وەك دەفەرموێت ﴿ فَالِقُ ٱلۡإِصۡبَاحِ وَجَعَلَ ٱلَّيۡلَ سَكَنٗا ﴾ الأنعام: ٩٦ واتە "هەرئەو زاتەیە بەیانیان فەراهەم دەهێنێت و ئاسۆ روناك دەکاتەوە و شەوی کردووە بەهۆی ئارامی و خامۆشی ."هەروەها دەفەرمویت ﴿ أَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا جَعَلۡنَا ٱلَّيۡلَ لِيَسۡكُنُواْ فِيهِ ﴾ النمل: ٨٦ واتە "ئایا ئەو خەڵکە نەیانبینیوە کە بەڕاستی ئێمە شەومان تاریك کردووە، تا تیایدا بحەسێنەوە".

لە بنەڕەتی پێکهاتەی مرۆڤدا، پێویستی بە ئارامی شەو هەیە، لەو کاتە دەروونی ئامادەدەبێت بۆ هەرشتێك کە توشی دەبێت لەو ئارامییەدا. وەحی خوایی گەورەترین هۆکاری ئەو خامۆشی و ئارامییە.

ئەم روانگەیە یەکێکە لە رووە تەفسیرییەکان (تابوت) لە فەرمایشتی پەروەردگار ﴿ وَقَالَ لَهُمۡ نَبِيُّهُمۡ إِنَّ ءَايَةَ مُلۡكِهِۦٓ أَن يَأۡتِيَكُمُ ٱلتَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ ﴾ البقرة: ٢٤٨ واتە"ئەوسا پێغەمبەرەکەیان پێی وتن: بەراستی نیشانەی پاشایەتی گالوت ئەوەیە: سندووقەکەتان بۆ دێتەوە، ئاسوودەیی و ئارامی تێدایە لە لایەن پەروەردگارتانەوەیە".

بۆیە کەسی ڕوووەرگێر لە قورئان توشی ئازاری دەروونی دەبێت وەك پەروەردگار دەفەرمویێت ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ﴾ طه: ١٢٤ واتە "ئەوەی ڕوو وەربگێڕێت لە بەرنامە و یادی من و پشتی تیٚ بکات، بێگومان بۆ ئەو جۆرە کەسانە ژیانێکی ترش و تاڵ و ناخۆش پێش دێت".

ژیانی ئاسوودەیی ڕاستەقینە بۆ کەس نابێت تەنیا بۆ ئەهلی باوەڕ نەبێت وەك دەفەرمویێت ﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ﴾ النحل: ٩٧ واتە" ئەوەی کار و کردەوەی چاکەی کردبێت، پیاو بێت یان ئافرەت، لەکاتێکدا بڕوادار بێت، سوێند بە خوا بەژیانێکی کامەران و ئاسوودە لە دنیادا دەیژێنین".

مەبەست ئەوەیە، ئەو کەسەی بیر لە بایەخپێدانی پێغەمبەر ﷺ بکاتەوە بەرامبەر دەنگی قورئان لە شەودا کە فەرمووی "من پێگەی ئەشعرییەکان بە خوێندنی قورئانی شەوانەیان دەناسم". کاتێکیش بە ئەبو موسای فەرموو "گەر منت دەبینی کاتێك دوێنی شەو گوێم لە خوێندنی قورئانت گرتبوو". هەروەها ستایشی ئەو بۆ (شريح الحضرمي) هاوەڵی بەوەی کە "پیاوێکە قورئان ناکاتە سەرین". دابەزینی فریشتەکان وەك ئەستێرەکان لە کاتی خوێندنی ئوسەیدی کوڕی حضیر بۆ سوڕەتی (البقرە). هەروەها ستایشی خوای گەورە بۆ دەستەیەك بەوەی" ئایەتەکانی خوا لە کاتی شەوانە دەخوێنن ...."هتد.

هەرچی بیر لەمانە لە هەمووی بکاتەوە.. ئایا ڕێگەدەدات شەوەکەی بەڕێبکات بە شەوخونی لەگەڵ ڕابواردنی هاوڕێکانی، یان هەڵدانەوەی پەڕەکانی ئینتەرنێت و سەیرکردنی گرتە ڤیدیۆییەکانی یویتیوب لەسەر ئینتەرێت؟! ئایا هیچ ڕۆژێك دەڕوا ماندووبوونی تێدا نەبێت لە گەڕان بەدوای کۆمێنێت بیٚ سوود لەسەر تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان؟ ئەمەیە ڕۆیشتنی تەمەن کە هەفتەیەك تێناپەڕێت کە لە تازیەك دەگوترێت "أحسن الله عزاك".، ئایا تەمەن هەموو بەڕیٚ دەکەین لە ڕابواردن و شتی بیٚ کەڵك، لە کاتێکدا ئێمە هیچ تام و چێژمان لە شیرینی کتێبەکەی پەروەردگار لە شەوانە نەکردبێت؟

..........................................................................

## • لەگەڵ دڵە بەردینییەکان:

قسەکردن لەبارەی دڵڕەقی قسەکردنێکە پڕە لە خەفت و پەژارە، لە بەڵایەکانی ئەم سەردەمە ئەوەیە کە شەرم لە ئامۆژگاریکردن لە بارەی دڵڕەقی ناکەین لە کاتێکدا دڵمان وەك بەردە یاخود لەبەردیش رەقترە.. بەڵام براگیان با گفتوگۆیەك بکەین گفتوگۆیەکی بەندکراوانە، ئەوانەی خەم و ئازاری خۆیان دەردەخەن، بۆ ئەوەی خۆیان لە بەندینخانەی تاوانەکانیان رزگار بکەن.

زۆرم لە کتێبە ئیمانی و ئامۆژگارییەکان خوێندۆتەوە، زۆربەی ئامڕازەکانی باسیان کردوون تاقیم کردۆتەوە، بڕوام پێ بکە کە من هەموو ئەمانەم دیووە سوودەکانیان سنورداره، نکۆڵی لەوە ناکەم کە سوودیان هەبووە، بەڵام سوودەکانیان کرداری نەبووە بەو ئەندازەیەی کە من چاوەڕێم لێ دەکردن، زانیم کە چارەسەری راستەقینەی چالاکی سەرکەوتوو سەرسوڕهێنەر لە تاکە دەرمانێك دایە، تەنیا یەك دەرمانە نەك زیاتر، هەر کاتێك بەکارمهێنابێت شیفام لە دەروونی خۆم دەبینی، هەر کاتێکیش دووربم لێی نەخۆشییەکان دەگەڕێنەوە سەرم، ئەم چارەسەرەش بە کورتی بریتییە لە (وردبوونەوە و سەرنجدانە لە قورئان - التدبر).

وازبێنە لەوشتانەی درەمانخانە ئیمانییەکان بۆتی باس دەکەن، واز لەوانەش بێنە کە بە چارەسەری گونجاو وەسفی دەکەن، لەبری ئەمانە (وردبوونە و سەرنجدان لە قورئان - التدبر) بەکاربهێنە، ئینجا لە نەفس و باوەڕ و هێزی خۆت لەسەر فەرمانبەرداری خوا و رێگریکردنت لە خراپە و ئاسوودەیی دەروونت لە ململانێی فیکرییەکان شتێك دەبینی کە سەرسامبوون پێیەوە لێی ون نابێت.

هەرکەمتەرخەمییەك کە مرۆڤ تێی دەکەوێت، جا کەمتەرخەمی لادان بێت لە شەریعەت، یان کەمتەرخەمی رەفتاری بێت بەهۆی خۆبەدەستەوەدان بۆ هۆکارەکانی شەهوەت، ئەوا لقێکن لە دڵڕەقی.

ئایا دەزانی دڵڕەقی لە چی روودەدات؟

دڵڕەقی بەهۆی دووربوون لە وەحی خوایی سەرچاوەی گرتووە، ئایا نابینی کە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿

أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن

قَبۡلُ فَطَالَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَمَدُ فَقَسَتۡ قُلُوبُهُمۡۖ ﴾ الحديد: ١٦ ئواتە "ئایا ئیتر کاتی ئەوە نەهاتووە بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە، دڵەکانیان بە نوری ئیمان ملکەچ وروناك بۆتەوە، ترسی خوای تێدا بڕوێنن بەهۆی یادی بەردەوامی خوا و ئەو قورئانەی کە ڕەوانە کراوە، وەك ئەو کەسانە نەبن کە کتێبی ئاسمانییان بۆ ڕەوانەکرا، بەڵام دوای تێپەڕ بوونی ماوەیەکی دوورو درێژ، دڵیان ڕەق و ڕەش بوو".

بینیت ئەی براکەم؟"فطال علیهم الأمد" ئەمە تێپەڕینی ماوەیەکی درێژە..!!

کاتێك ماوەیەکی درێژ بەسەریاندا تێپەڕی دڵیان ڕەق بوو.. گەر پەیمانیان لەگەڵ وەحی نوێ بکردبایەوە دڵەکانیان زیندوو دەبووە.

کاتێك دڵ ڕەق دەبێت، مرۆڤ زاتی ئەوە دەکات لەبەر هەوا و ئارەزووی لە شەریعەدا لابدات..

کاتێك دڵ ڕەق دەبیت، مرۆڤ بە سووك سەیری فەرمانبەرداری خوا دەکات و لەسەرخۆی قورسی دەکات.

کاتێك دڵ ڕەق دەبێت، دونیا لەپێش چاوی مرۆڤ گەورە دەبێت و پێشوازی لێ دەکات و پشت لەو پەیامە دەکات کە بۆ مرۆڤایەتی هاتووە.. کاتێك دڵ ڕەق دەبێت پەرۆشی و دەمارگیری بۆ دینی خوا بێهێز دەبێت.

کەواتە چارەسەر چییە؟

چارەسەر بۆ زیندووکردنەوەی سینە بریتییە لە تیمارکردنی بە (وردبوونەوە و سەرنجدان لە قورئان - التدبر).. بۆ خاتری خوای پەروەردگار لەم فەرمایشتەی خوای میهرەبان تێ بفکرە ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ یونس: ٥٧ واتە "ئەی خەڵکینە، بەراستی ئێوە ئامۆژگاریەکی گەورە و گرنگتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە کە(قورئانە) شیفا و چارەسەریشە بۆ نەخۆشی دڵ و دەروونەکان و ڕێ نیشاندەر و ڕەحمەتیشە بۆ ئیمانداران".

بەمشێوەیە ئایەتەکە زۆر بە ڕوونی و ئاشکرایی واتەکە دێنێتە بەر چاو" شفاء لما في الصدور".

بەڵام ئەی ئەمە چییە کە لە سینە و دڵەکان دایە؟

لە سینە و دڵەکان شەهوەتەکانن بەدیار دەکەون، لە سینە و دڵەکان گومانەکانن هاوار دەکەن، لە سینە و دڵەکان رووپۆشی ئەستورن هەن، لە سینە و دڵەکان چینی داپۆشراو لە ژەنگ و چڵکی گوناهـ هەیە. ﴿ كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴾ المطففين: ١٤ واتە "نەخێر، وانییە (ئەو نەفامانە تێناگەن و داناچڵەکێن) بەڵکو دڵیان ژەنگی هێناوە و چڵکی گوناهـ دایپۆشیوە لە سەرەنجامی ئەو کاروکردەوانەی کە دەیانکرد".

چارەسەری هەموو ئەمانەی لە ناو دڵ و سینەکان هەیە بریتییە لە فەرمایشتی پەروەردەگار ﴿ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ يونس: ٥٧

گەر دڵەکان شیفا کران، بەرامبەر فەرمانبەردارییەکان چاپوك دەبن..

گەر دڵەکان شیفا کران، بە نەرمی و ئاسانی ملکەچی دەقەکان دەبن و لە لادان هەڵدێن.

گەر دڵەکان شیفا کران، بە رۆژی دوایی دەبەسترێنەوە و بە سوکی سەیری بێ کەڵکی دونیا دەکەن.

گەر دڵەکان شیفا کران، بە هەڵگرتنی خەمی سەرخستنی دینی راستی بەسەر هەموو دینەکانی تر پڕ دەبن.

لە هەمووشی سەیرتر گەر دڵەکان شیفا کران، ئامانجە بچووکەکان بچوکتر دەکەنەوە، ئەو ئامانجانەی دەروونە نەخۆشەکان گەورەیان کردبوون..

حەزی ناوبانگی..

خۆشەویستی دەرکەوتن..

حەزی سەرکردایەتی و پلەوپایەی بەرزی لە چاوی خەڵکدا..

ئارەزووی گەورەبوون بەسەر کەسانی نزیکی و هاوتەمەن و هاوشێوەی خۆی..

ئەو نەفسەی قورئان شیفای بدات، هەموو ئەمانە بە کەفوکوڵی راگەیاندن دەزانێت، کە رووی دەرەوەی بە تامە، گەر مرۆڤ هەندێکیان تاقی بکاتەوە بێ بایەخیەکەی بۆ ئاشکرا دەبێت.

ئەو دڵە بۆ یەك ساتیش شایەنی ماندوو بوون نییە چ جای تینویەتی چەند ساڵە، یان چ جای ئەوەی مرۆڤ ئەوە قبوڵ بکات کە دەستکاری وەحی بکات تەنیا لەبەرخاتری ئەوەی پێی بگوترێت کە ئەوە کەسێکی نیشتیمانی و پێشکەوتنخوازە لەگەڵ چەندانی کاری تر کە چاوەکان لە بینینی راستی دادەپۆشن.

ئایا براکەم پێت وایە دەستکاری کردنی شەریعەت پەیوەندی نییە بە دڵڕەقی؟! لەگەڵ من ئەو ئایەتە بخوێنەوە] ﴿ فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ لَعَنَّٰهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَٰسِيَةً ۖ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ ﴾ المائدة: ١٣ واتە "نەفرەتمان لێکردن و دڵەکانیانمان رەق و سەخت و رەش کرد (چونکە یەکێك لە سیفەتەکانیان ئەوەیە) کە: قسە لە جێی خۆیدا ناکەن و جێی دەگۆڕن (بە ئارەزووی خۆیان دەستکاریی تەوراتیشیان کردووە)".

بەهەرحاڵ، با دووبارە ئایەتی شیفا بخوێنینەوە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾ يونس: ٥٧

ئەی خوایە.. خوا دەفەرموێت "شیفایە بۆ سینە و دڵەکان"؟

بەڵێ بەمشێوە روون و ئاشکرایە شیفایە بۆ سینە و دڵەکان.

براکەم ئەم قورئانە سحرێکی سەیری هەیە لە زیندووکردنەوەی دڵ و جولاندنی دەروون و ئاوەدانکردنەوەی بە شەوق و خۆشەویستی بۆ پەروەردگاری.

نهێنی ئەمەش ئەوەیە کە ئەم قورئانە کاریگەرییەکی شاراوەی سەرسوڕهێنەری هەیە لە باوەڕپێهێنان و ملکەچکردنی نەفسی مرۆڤ، وەك دەفەرموێت ﴿ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَيُؤْمِنُوا۟ بِهِۦ فَتُخْبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمْ ﴾ الحج: ٥٤ واتە "بۆ ئەوەش ئەوانەی زانست و زانیاریان پێ بەخشراوە دڵنیابن و بزانن کە بێگومان ئەم قورئانە حەقیقەت و راستە و لەلایەن پەروەردگاری تۆوە (ئەی محەمەد ﷺ) رەوانە کراوە، ئینجا بڕوای پتەوی پێ دەهێنن و دڵەکانیشیان ملکەچ دەبێت بۆ خوا".

کاتێك دڵەکان ملکەچ دەبن..

بە کاریگەری باوەڕ کارتێکەر بوون..

کۆتوبەندی ئەندامەکانی جەستە شکان..

زمان بە زیکری خوا هۆگر بوو..

ئەندامەکان بە کڕنوش و سوژدە و هەوڵدان بۆ دینی خوا کەوتنە جوڵە.. وەك خوای پەروەردگار وێنای دەکات ﴿ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ﴾ الزمر: ٢٣ سەرنج بدە چۆن تەزووی پێدادێت.. پاشان نەرم دەبێت.. ئەمە ئەو ترسەیە کە لە دوای ئەو ملکەچبوونە دێت، ئەمەیە شکۆی قورئان.

.....................................................................

- **بێ نەواکان**

حاڵەتەکانی بەلارێداچوون لە دینداری، حاڵەتێکن دڵەکان دەتوێننەوە، بە تایبەت گەر کەسی بەلارێداچوو هاورێیەکی نزیکت بێت و چەند رۆژێکی ئیمانی و زانستی لەگەڵی ژیابی.

لە نێوان حاڵەتەکانی بەلارێداچوون جیاوازی زۆر هەیە..

کێشەی بەشێکیان (زانستییە) بە هۆی بوونی مەترسییەکی زۆری عەقڵە رۆشنبیرییەکان کە بەرامبەری چۆك دادەنێت و هەڵدێت..

کێشەی بەشێکی دیکەیان (رەوشتییە) بەهۆی بێهێزی خۆی بەرامبەر چێژی گاڵتە و رابواردنەوە..

زۆرجار ئەم بابەتە پێك دێت لە دووانەی (ئارەزوو و گومان)، بەڵام یەکیان بەسەری ئەوی دیکەیان بە گوێرەی حاڵەتەکە زاڵ دەبێت، یان گومان دایدەماڵێت و بەرەو رۆچوون لە شەهەوەتەکان و ئارەزووەکان دەیبات، یاخود هەواو و ئارەزوو بەسەریدا زاڵ دەبێت بەرەو گومان و فیڵ دەبات.

من تا ئەو ساتەش مامەڵە لەگەڵ ئەو جۆرە حاڵاتانە دەکەم، هیچ چارەسەرێکم بە سوودتر لە (وردبوونەوە و سەرنجدان لە قورئان) نەدیوەتەوە. چونکە قورئان هەردوو چارەسەری (زانستی و باوەڕی) کۆدەکاتەوە، کە جگە لە قورئان لە هیچ شتێکی تردا بوونی نیە. قورئان نهێنی سەیری لە ملکەچکردنی دڵی مرۆڤەکان هەیە ﴿ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَيُؤْمِنُوا۟ بِهِۦ فَتُخْبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمْ ﴾ گەر شوێنەکە بۆ باوەڕبوون ئامادەبوو، ئەوا نەرم دەبێت بۆ وەرگرتنی حەق و ملکەچبوون بۆی، وەك دەفەرموێت﴿ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا مَّثَانِىَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ﴾ الزمر: ٢٣

گەر هیدایەت و رێنوێنی قورئان بەرامبەر رەفتاری رەوتە فیکرییەکانی ئەمرۆ بەراوربکرێ، ئەوا لە قورئان جۆرێك لە روونکردنەوەی زانست و حەقبێژی و کلیلی رێنوێنی بۆ ئەو پرسانە تێدایە کە لە هیچ شتی تردا بوونی نییە.

مەبەستم ئەوەیە گەر کەسی سەرنجدەر لە قورئان جیاوازیکردنی قورئانی بینی لە نێوان کەسی دانپێدانەر بە کەمتەرخییەکانی و کەسی بیانوهێنەر بۆ کەمتەرخەمییەکان، هەردوو نمونەکەش لە قورئاندا هاتووە، کە قورئان کەسی یەکەمی نزیك کردووە لە لێخۆشبوون ﴿ وَءَاخَرُونَ ٱعۡتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمۡ خَلَطُواْ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴾ التوبة: ١٠٢ واتە "کەسانێکی تریش هەن کە دان بەگوناه و هەڵەکانیاندا دەنێن و کرداری چاك و کرداری خراپیشیان تێکەڵ کردووە، ئەمانە نزیکە خوا تەوبەیان لێ وەربگرێت، چونکە بەڕاستی خوا لێخۆشبوو میهرەبانە". کەسی دووەمیش کە بیانو بە فێڵی شیکردنەوە بۆ کەمتەرخەمییەکانی دەهێنێتەوە ئەوانە خوای گەورە رەشی کردوونەتەوە ﴿ وَلَقَدۡ عَلِمۡتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعۡتَدَوۡاْ مِنكُمۡ فِي ٱلسَّبۡتِ فَقُلۡنَا لَهُمۡ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴾ البقرة: ٦٥ واتە "سوێند بە خوا بێگومان زانیووتانە و ئاگادارن چیمان بەسەر ئەوانەتاندا هێنا رۆژانی شەممە دەستدرێژییان دەکرد و لە سنوور دەردەچوون، (لەبەر ئەوە بڕیارمانداو) وتمان: ببنە مەیموونی دوورخراوە لە ڕەحمەتی خوا".

تەنیا بە تاوانی راوکردن لە رۆژی قەدەغەکراو شایەنی ئەو سزایە نەبوون، بەنی ئیسرائیل تاوانی گەورەتریان لەمە ئەنجامدا و خوای گەورە سزای نەداون، بەڵام فێڵکردنیان لەسەر دەقەکان بە تەفسیرکردن، توڕەبوونی خوای گەورەیان زیاتر کرد.

گەر کەسی سەرنجدەر لە قورئان، ببینێت کە چۆن قورئان مەرجعیەتی هاوەڵەکانی پێغەمبەر لە تێگەیشتنی ئیسلام بەرز رادەگرێت، تێگەیشتنی ئیسلامی بە ئەزموونی مرۆڤایەتی بەستۆتەوە وەك فەرمایشتی پەروەردگار ﴿ فَإِنۡ ءَامَنُواْ بِمِثۡلِ مَآ ءَامَنتُم ﴾ البقرة: ١٣٧ واتە "ئەگەر ئەوان (جولەکە و گاورەکان) باوەڕیان هێنا، وەك ئەوەی ئێوە باوەڕتان پێ هێناوە". هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ ﴾ التوبة: ١٠٠ واتە "ئەوانەی کە بە رێکوپێکی شوێنیان کەوتوون". هەروەها دەفەرموێت ﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ ﴾ الفاتحة: ٧ واتە "بەرنامە و رێبازی ئەوانەی لە ناز و نیعمەتی خۆت بەهرەوەرت کردوون". دەفەرموێت ﴿ وَإِنَّآ أَوۡ إِيَّاكُمۡ لَعَلَىٰ هُدًى أَوۡ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴾ سبأ:

٢٤ واتە "بێگومان ئێمە، یان ئێوە لەسەر ڕێگەی ڕاست و دروستی هیدایەتین، یاخود لە گومڕاییەکی ئاشکرادا ڕۆچوین". دەفەرموێت ﴿ أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُوا لَكُمْ ﴾ البقرة: ٧٥ واتە "ئایا ئێوە(ئەی گرۆی ئیمانداران) بە تەمان و ئومێدەوارن کە جولەکە ئیمان و باوەڕ بهێنن بە ئاینەکەی ئێوە". هەروەها دەفەرموێت﴿ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَىٰ أُولِي الْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنبِطُونَهُ مِنْهُمْ ﴾ النساء: ٨٣ واتە "خۆ ئەگەر ئەو هەواڵەیان بڵاو نەکردایەتەوە و بیانگێڕایەتەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ یان بۆ لای کاربەدەستانێك کە لە خۆیانن، ئەوە ئەوانەی کەلە نهێنی هەواڵەکان تێدەگەن و دەکۆڵنەوە، نهێنی و ڕازەکانیان لیٚ دەردەهێنا".

لە نمونەی ئەم ئایەتە روونانە خوای گەورە ئاشکرای دەکات کە وەحی بریتی نییە لە دەقێکی کراوە، بەڵکو بەستراوەتەوە بە ڕێنیشاندان بە ئەزموونی مرۆڤانی پێشوو. لێرەدا زۆر بە روونی فەرمانمان پیٚ دەکات کە باوەڕ بهێنین وەکچۆن هاوەڵە بەڕێزەکان باوەڕیان هێناوە، بە شێوەیەکی باش پەیڕەویان بکەین، زۆر بەروونی فەرمانمان پیٚ دەکات کە پرسەکان بۆلای خاوەن زانستەکان بگەڕێنینەوە، هەموو ئەمانە روونی دەکەنەوە کە ئیسلام بریتی نییە لە تەنیا فیکیرەیەك کە مانای جۆراجۆری هەبێت و هەر مرۆڤێك چۆنی بوێت وا تەفسیری بکات. بەڵکو (نموەیەکی پێشوو) هەیە کە حاکمی ئەو تەفسیرانەیە کە لەدوای ئەو دێن.

گەر کەسی سەرنجدەری قورئان دیسان روونکردنەوەی قورئانی بۆ بێکەڵکردنی دونیا ببینێت، هەروەها خوای گەورە چەندان نمونەی هێناوەتەوە لە نەهیکردن لە ئاوڕدانەوە لە دونیا﴿ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ﴾ طه: ١٣١ واتە "(ئەی ئیماندار) تۆ چاوەکانت مەبڕە ئەو ناز و نیعمەتەی کە هەندێك خەڵکمان لیٚ بەهرەوەر کردووە، کە زینەت و ڕازاوەی ژیانی دنیایە، بۆ ئەوەی لەو نازو نیعمەتە تاقیانبکەینەوە". هەروەها دەفەرموێت ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ فَإِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾ ﴾ الأحزاب: ٢٨ - ٢٩

واتە "ئەی پێغەمبەر بە هاوسەرانت بڵێ: ئەگەر ئێوە تەنها ژیانی دنیا و ڕازاوەییەکەیتان دەوێت، وەرن با هەندێك شتومەك و پارە و سامانتان پێ ببەخشم، لەوەودواش بە جوانترین شێوە دەست بەردارتان ببم (٢٨)خۆ ئەگەر ئێوە خوا و پێغەمبەرەکەی و پاداشتی ڕۆژی قیامەتان دەوێت، ئەوە دڵنیابن کە خوا بۆ چاکەکارانتان پاداشتی زۆر گەورە و بێئەندازەی ئامادەکردووە (پێغەمبەر هەموو هاوسەرانی یەك یەك تاقیکردەوە هەموانیان خوا و پێغەمبەر و پاداشتی قیامەتیان هەڵبژارد".

بە پێوەری قورئان سەیری دونیا بکە.

هەروەها گەر کەسی سەرنجدەری قورئان ببینێت ئەوەی لە قورئان هەیە لە ڕوونکردنەوەی خوای گەورە لە بێ بایەخ تەماشاکردنی بێ باوەڕەکان، بە ئەندازەیەکە کە قورئان ئەوانی لە پلەی ئاژەڵ و ماڵات و گوێدرێژەکان و سەگەکان و پیسی و نەزانین و بێ عەقڵی و کوێری و کەڕی و لاڵی و گومڕای و سەرلێشێوان داناوە.. چەندان وەسفی تری قورئانی سەرسوڕهێنەر کە دڵی خوێنەری قورئان بە واتاکانی سوکسەیرکردنی ئەوانە پڕ دەکات. وەك دەفەرموێت ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأۡكُلُونَ كَمَا تَأۡكُلُ ٱلۡأَنۡعَٰمُ وَٱلنَّارُ مَثۡوٗى لَّهُمۡ ﴾ محمد: ١٢ واتە "ئەوانەش بێبڕوا بوون لەم دنیایەدا ڕادەبوێرن و دەخۆن وەك ئاژەڵ، لە ئایندەشدا دۆزەلا جێ و شوێنیانە". هەروەها دەفەرموێت ﴿إِنۡ هُمۡ إِلَّا كَٱلۡأَنۡعَٰمِۖ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴾ الفرقان: ٤٤ واتە: "ئەوانە ماڵات نەبێت، هیچی ترنین، بەڵکو گومڕاتریشن لە ماڵات. دەفەرموێت ﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ ثُمَّ لَمۡ يَحۡمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلۡحِمَارِ يَحۡمِلُ أَسۡفَارَۢا ﴾ الجمعة: ٥ واته"وێنەی ئەوانەی کە تەوراتیان درا بەسەردا تا پەیڕەوی بکەن، پاشان هەڵیان نەگرت و پەیڕەویان نەکرد، وەك: گوێدرێژێك وایە کە بارە کتێبێکی هەڵگرتبێت". دەفەرموێت ﴿فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلۡكَلۡبِ إِن تَحۡمِلۡ عَلَيۡهِ يَلۡهَثۡ أَوۡ تَتۡرُكۡهُ يَلۡهَث ﴾ الأعراف: ١٧٦ واتە "نموونەی (ئەو جۆرە کەسانە) وەکو نموونەی سەگ وایە ئەگەر دەری بکەیت و پیایدا هەڵبشاخێیت هەناسە بڕکێیەتی (زمان دەردەکێشێت)، یاخود ئەگەر وازی لێ بهێنیت ئەوە هەر هەناسە بڕکێیەتی". دەفەرموێت ﴿إِنَّ شَرَّ

ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾ الأنفال: ٥٥ واتە "بەڕاستی خراپترینی زیندەوەران لای خوا ئەوانەن کە بێ باوەڕ بوون، چونکە ئەوان باوەڕ ناهێنن". دەفەرموێت ﴿ كَذَٰلِكَ يَجۡعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾ الأنعام: ١٢٥ واتە "بەڕاستی خراپترینی زیندەوەران لای خوا ئەوانەن کە بێ باوەڕ بوون، چونکە ئەوان باوەڕ ناهێنن". دەفەرموێت ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡمُشۡرِكُونَ نَجَسٞ ﴾ التوبة: ٢٨ واتە "ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە چاك بزانن کە موشریك و هاوەڵگەران ناپوخت و پیسن".

ئەگەر کەسی سەرنجدەری قورئان ببینێت، ئەوەی لە قورئان هەیە گرنگیپێدانێکی لەرادەبەدەرە، لەبارەی خۆپاراستنی پەیوەندی نێوان هەردوو رەگەز وەك دانانی پەردەیەك لە نێوان هەردوو رەگەز وەك دەفەرموێت ﴿ وَإِذَا سَأَلۡتُمُوهُنَّ مَتَٰعٗا فَسۡـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٖۚ ذَٰلِكُمۡ أَطۡهَرُ لِقُلُوبِكُمۡ ﴾ الأحزاب: ٥٣ واتە "کاتێك داوای کەلوپەلێکتان لە خێزانەکانی پێغەمبەر کرد لە پشتی پەردەوە داوایان لێ بکەن، ئا ئەو جۆرە رەفتارە چاکتر و پاکترە بۆ دڵی ئێوە و ئەوانیش". هانی ئافرەتانی باوەڕدار دەدات لە ماڵەکانیان دابنیشن ﴿ وَقَرۡنَ فِي بُيُوتِكُنَّ ﴾ الأحزاب: ٣٣ واتە "لە ماڵەکانی خۆتاندا بە سەنگینی و سەلاری بسرەوین". لەلایەکی تر نەهی دەکات لە نەرمینواندن لە قسەکردنی ئافرەت ﴿ فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ ﴾ الأحزاب: ٣٢ واتە " قسە بە ناسکی و نەرمی مەکەن". هەروەها نەهیکردن لەهەر جوڵەیەك کە بەهۆیەوە پیاو هەست بە جوانی ئافرەت بکات ﴿ وَلَا يَضۡرِبۡنَ بِأَرۡجُلِهِنَّ لِيُعۡلَمَ مَا يُخۡفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ﴾ النور: ٣١ واتە "نابێت ئافرەتانی ئیماندار قاچیان دەربخەن و پێیان بدەن بە زەویدا (تا دەنگی خشڵ و پاوانەکانیان بێت) و بزانرێت کە زینەتدارو خشڵدارن.." چەندان ئایەتی تر.

ئەگەر کەسی سەرنجدەر لە قورئان گەورەیی قورئان ببینێت بۆ پرسی بەندایەتیکردنی خوا، وەك وێناکردنی بۆ باوەڕدا و باسکردنی خوای گەورە لە هەموو حاڵەتێکدا ﴿ ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا

وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ ﴾ آل عمران: ١٩١ واتە "ئەوانەی یادی خوا دەکەن لەکاتێکدا کە بەپێوەن یان دانیشتوون یان ڕاکشاوون (لە هیچ حاڵەتێکدا یادی ئەوزاتە فەرامۆش ناکەن)". کاتێکیش خوای گەورە دەیەوێت هاوەڵە بەڕێزەکان بە جوانترین سیفەت وەسف بکات ﴿ مُّحَمَّدٞ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا ﴾ الفتح: ٢٩ واتە "محەمەد ﷺ ڕەوانەکراوی خوایە، ئەوانەش کەلە خزمەتیدان و شوێنی کەوتوون توند و تیژن بەرامبەر بێباوەڕان و بەبەزەیی و میهرەبانن لە نێوان خۆیاندا، دەیانبینیت سەرگەرمی نوێژ و خواپەرستین، کڕنوش و سوژدە دەبەن". هەروەها ببینە چۆن وەسفی شەوانەی دەکات کە زۆربەی کاتەکەی بۆ نوێژ چووە ﴿ إِنَّ رَبَّكَ يَعۡلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدۡنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيۡلِ وَنِصۡفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٞ مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَۚ ﴾ المزمل: ٢٠ واتە "بەڕاستی ئەو پەروەردگارەت چاك دەزانێت کە تۆ نزیکەی دوو بەشی شەو یاخود نیوەی یان سێیەکی هەڵدەسیت و شەونوێژ دەکەیت، هەروەها هەندێك لەوانەی کە لەگەڵتان".

مەبەست لێرەد ئەوەیە، گەر کەسی سەرنجدەری لە قورئان هیدایەت و خەڵاتی قورئان لەو پرسانەی باسمان کرد و لەوانەشی هاوشێوەی ئەون ببینێت، پاشان لەگەڵ حاڵەتەکانی لایەنە فیکرییەکانی ئەم سەردەمە بەراوردی بکات، ببینێت ئەوەی لە قسەی ئەو جۆرە کەسانە هەیە لە لادان و تەفسیکردنی دەقەکانە بۆ ئەوەی لەگەل زەوقی ڕۆژئاوایی بگونجێت، گاڵتەیە بە پەیڕەویکردنی سەلەف لە تێگەیشتنی ئیسلام، پڕکردنی دڵ بە خۆشەویستی دونیا، هۆگربوون بە گەورە سەیرکردنی کوفر، لابردنی سنورەکان لە نێوان هەردوو ڕەگەز، خاوبوونەوەی بەندایەتیکردن... هتد. گەر ئەو کەسە قورئان و ئەو حاڵەتانە بەراورد بکات، ئەو کات دەرگاکانی زانینی ڕاستی (حەق)ی بۆ دەکرێتەوە.

..................................................................

## • درێژکردنەوەی ڕێگاکە:

کاتێك گوێم لە هەندێك بیرمەندە ئیسلامییەکان دەبێت کە باس لە پێویستی بەرەنگاربوونەوە و بەرپەرچدانەوەی فیکرە تازەکان لە ڕێگەی توێژینەوەی فیکری فراوان دەکەن، نایشارمە کە من ڕێزی تەواو لە سووربوونیان و خەمخۆریان بۆ سەلامەتی ئیسلام لە داگیرکردنی عەلمانی سەردەم دەگرم.

بەڵام من گومانی زۆرم هەیە لە چوونە ناو ئەو زۆرداڕیە بە پشت بە ستن بە توێژینەوەی فیکری. من رایەکی تایبەت بە خۆم هەیە بەڵام زۆر ئاشکرای ناکەم، چونکە وای دەبینم بەشێك لە بیرمەندە ئیسلامییەکان پێیان وایە جۆرێکە لە لاوازی و کەمتەرخەمی، بۆیە بێ دەنگ دەبم.

رای من زۆر بە کورتی بریتییە لەوەی کە: بەرەنگاربوونەوەی لادانە فیکرییە سەردەمییەکان زۆر ساناترن لەوەی ئێمەی بیری لێدەکەینەوە.

گەر سەرکەوتوو بووین لە گۆشکردنی گەنجی موسڵمان بە چوونە بەر قورئان، وردبوونەوە و سەرنجدان لێی، خوێندنەوەی واتاکانی قورئان، هەموو ئەو لادانە فیکرییە سەردەمیانە و گومانەکان بەرامبەر گەنجی موسڵمان (ئەو گەنجەی بەدوای حەقدا دەگەڕێت) لە یەکەم خەتمی قورئان ورد و خاش دەبن، بەڵام خەتمێك بە تێڕامان و سەرنج دان لێی.

سوێندت دەدەم بە خوا، گەر گەنجی موسڵمان (ئەو گەنجەی بەدوا حەقدا دەگەڕێت) ئایەتەکانی قورئان دەربارەی بێ بایەخی کافر بخوێنێتەوە.

ئایەتەکانی قورئان دەربارەی دونیا وەك ئامراز و ئاخیرەت وەك ئامانج

ئایەتەکانی قورئان دەربارەی خۆپاراستن و ڕێزگرتن لە سنوری نێوان هەردوو رەگەز..

ئایەتەکانی قورئان دەربارەی دوورخستنەوەی هەر بیرۆکەیەك کە پێچەوانەی وەحی بێت..

ئایەتەکانی قورئان دەربارەی واجبی راسپاردنی کۆمەڵگە لە ڕێگەی شەریعەتی فەرمان بەچاکەکردن و نەهیکردن لە خراپە.

ئایەتەکانی قورئان دەربارەی ململانێی لەمێژنەی نێوان حەق و ناحەق..

ئایەتەکانی قورئان دەربارەی واجبی دەسەڵاتی شەریعەت لەسەر هەموو کۆمەڵگایەکان..

ئایەتەکانی قورئان دەربارەی رەتکردنەوەی گومان و چەسپاندنی دڵنیایی..
ئایەتەکانی قورئان دەربارەی سزادانی قەومەکان بە بوونیان بە مەیمونی دوورکەوتوو لە رەحمەتی خوا، بەهۆی تەفسیرکردنی دەقەکان بە گوێرەی حەز و ئارەزوویان.
ئایەتەکانی قورئان دەربارەی بەستنەوەی کارەساتە گەردوونییەکان بە گوناھ و تاوانەکان..
ئایەتەکانی قورئان دەربارەی رێکخستنی خشتەی رابوون و هۆشیاربوونەوە لە نێوان یەکتاپەرستی و باوەڕ و فەریزەکان و ئامادەسازی هێزی مەدەنییەت... هتد
سوێندت دەدەم بە خوا، لە دوای ئەوانە چی دەمێنێت لە لادانە فیکرییەکانی سەردەم؟!
کاتێك گەنجی موسڵمانی لێکۆڵەر لەراستی ئەو جۆرە ئایەتانە دەخوێنێتەوە، خۆ ئەو گەنجە ئەو کات بەرامبەر "گوتارێکی فیکری"نییە، بەڵکو ئەو راستەوخۆ بەرامبەر"گوتاری خوایە".
بۆیە دوور رێگای لەبەردەمە: یان ملکەچبوون یان دووڕوویی فیکری..
کەواتە چارەسەری مامناوەندی بەرامبەر فەرمانەکانی پادشای پادشاکان خوای پەروەردگار نییە..
با بەتەنیا هەوڵبدەین بۆ هاندانی عەقڵی ساغی موسڵمانی سەردەم بۆ بەرەو قورئان چوون و سەرنجدان و تێفکرین لێی، لە پێناو گەڕان بە دوای راستیدا، بڕوام پێبکەن دەرەنجامی چاوەڕوانکراو دەبینین.
تاکە خوێندنێکی راستگۆیانەی کتێبەکەی پەروەردگار، لە مێشکی موسڵمان شتێك دروست دەکات، کە هەرچی درێژداڕییە فیکرییەکان هەیە بە زمانە پڕ باقربریقەکەیان دروستی ناکات..
تاکە خوێندنێکی راستگۆیانەی کتێبەکەی پەروەردگار.. بەسە بۆهەڵاوگێرکردنی هەرچی فرتوفێڵی گوتاری فیکری سەردەمە کە سەراوخونی بکات..
ئەم قورئانە کاتێك مرۆڤ بڕیار دەدات بە تەنیا و بە جدی بیخوێنێت.. بێگومان ئەو کاتەی لێی دەردەچێت جیاوازتر دەبێت لەو کاتەی دەستپێکردووە، ئەو قورئانە کەسایەتیت و پێوەرەکانت و پێوانەکانت و دەرمارگیرییەکانت و پەرۆشییەکانت و شێوازی پەیوەندییەکانت بە جیهان و زانست و زانیاری و مێژووشەوە هەڵاوگێر دەکاتەوە بەرەو باشە.

بەتایبەت.. گەر کەسی قورئانخوێن ئەوە لەبەر چاوی خۆی دابنێت کە ئەم قورئانە تەنیا بریتی نییە لە "زانییەرییەکان" و بە مێشکێکی ساردەوە مامەڵەی لەگەڵ بکات.. بەڵکو بریتییە لە "پەیامێك" کە پرسێکی گەورەی هەڵگرتووە.

یەکێك لە پرسە هەرگرنگەکان کە جێی سەرنجە لە قورئانی پیرۆزدا، بریتییە لە کاریگەربوونی پێغەمبەران بە قورئان بە کارتێکردنێکی ویژدانی و سۆزداری قوڵ..

نمونەیەك وەربگرە..

کاتێك خوای گەورە باس لە مێژووی پێغەمبەران دەکات، ڕاستەوخۆ لەدواییدا باسی حاڵیان دەکات کاتێك گوێیان لە ئایەتەکانی وەحی دەبوو، وەك دەفەرموێت ﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْرَٰٓءِيلَ وَمِمَّنْ هَدَيْنَا وَٱجْتَبَيْنَآ ۚ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتُ ٱلرَّحْمَـٰنِ خَرُّوا۟ سُجَّدًا وَبُكِيًّا ۩ ﴾ مریم: ٥٨ واتە "ئا ئەوانە کەسانێکن کە خوای گەورە ناز و نیعمەتی بەسەردا ڕشتوون لە پێغەمبەران، لە نەوەی ئادەم و ئەوانەش (کە لە کەشتیەکەدا) لەگەڵ نوحدا سوارمان کردن و لە نەوەی ئیبراهیم و یەعقوب و لەوانەی کە هیدایەتمان داون و هەڵمان بژاردوون، ئەوانە، هەرکاتێك ئایەتەکانی خوای میهرەبانیان بەسەردا بخوێنرێتەوە، بە پەلە سوژدە دەبەن و ئەسرین لە دیدەیان دەبارێت، (لە سۆز و خۆشەویستی پەروەردگاریان دڵانی پڕ لە نوورو ئیمانیان دەکوڵێت) و دەگرین".

ئەی خوایە..

ئەم ئایەتە "جۆر و جنسی پێغەمبەران" وێنا دەکات..

سەیرکە، توخوا چۆن پەیوەندییەکانیان بە "فەرمایشتی خوا"دەگاتە ئەندازەی کەوتنە سەرزەوی بە سوژدە و بارینی فرمێسکەکانیان بە گریان و کاریگەربوونیان.

چ پێ کاریگەربوونێکی ویژدانی و سۆزیی لەمە گەورەتر هەیە؟

خوای گەورە دیمەنێکی ترمان بۆ وەسف دەکات، کە خەیاڵی خوێنەری قورئان بەند دەکات، کاتێك باسی ئەهلی باوەڕ دەکات کە چۆن پێشوازی لە ئایەتەکانی وەحی دەکەن، ﴿ وَإِذَا سَمِعُوا۟ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ

﴿أَعۡيُنَهُمۡ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ﴾ المائدة: ٨٣ واتە "(ئەوانەیان کە بەشوێن ڕاستیدا دەگەڕێن) هەر کاتێك گوێیان لە قورئان دەبوو کە بۆ پێغەمبەر ﷺ دابەزیووە، دەبینیت چاوەکانیان ئەسرینی خۆشی هەڵدەڕێژێت". لە شوێنێکی تردا خوای گەورە شوێنکەوتەی قورئان نەك تەنیا لەسەر ویژدان بەڵکو لەسەر جەستەش نیشان دەدات کە دەفەرمویێت ﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ﴾ الزمر: ٢٣

بە هەرحاڵ..

گەر سەرکەوتووبووین لە باوەڕپێکردنی گەنجی موسڵمان بە ڕووتێکردنی لە قورئان بە شێوازی وردبوونەوە و سەرنجدانی ڕاستگۆیانە بۆ گەڕان بە شوێنی حەقدا..

قۆناغی باوەڕ دەمێنێت..

هەر کەسێك باوەڕ و ترسی لە خوای گەورە لەگەڵ بێت، ئەوا بەرەو ملکەچبوون بۆ خوای پەروەردگار دەیبات. ئەوەشی بۆ هەواو ئارەزوو شل بکات، ئەوکات دەکەوێتە تاریکی دووروویی فیکری..

دەبێت لە داهاتوو هەر ئاشکرای بکات بۆ هەمووان (وەك چۆن ئەوانی تر ئاشکریان کرد) کە "ڕێز لە بنەما شەرعییەکان دەگرێت" بەڵام لە نامۆی ناو دەروونی هەست دەکات کە ئەوەی دەیڵێت پێچەوانەی قورئانە..!

لێرەدا تەنیا یەك هەڵاوێر دەمێێت..

ئەوەی خاوەن کەسایەتییەکی مەعریفی ڕێك و ڕەوانە، مەبەستم ئەوەیە سەیری "کرۆکی بەڵگە سەلمێندراوەکان" بکات نەوەك "ڕواڵەتی گوتار"، ئەم کەسە پێویستی بە هیچ نییە جگە لە خوێندنەوەیەکی موجەڕەدانەی قورئان نەبێت.

بەڵام ئەوەی کەسایەتی فیکری بەچەند دەرد و نەخۆشییەك بناڵێنێت، باقوبریقی دیکۆر بخاتە پێش کرۆکی بەڵگە سەلمێندراوەکان.. ئەم جۆرە خەڵکە نەخۆشانە لە ڕاستیدا پێویستیان بە هەندێك نوسینی فیکری هەیە کە ڕەنگوڕوویەکی هەڵخەڵەتێنەری هەبێت.. وەك ئیبن تەیمیە لە ڕووداوێکی هاوشێوەدا لە کتێبی

"الرد على المنطقيين"، دەڵێت: " هەندێك لە خەڵك، هەر کاتێك ڕێگاکە وردتر و شاراوەتر بێت و پێشەکیەکی زۆرتر و درێژتری هەبێت بۆ ئەو سودی هەیە، چونکە خۆی وا ڕاهاتووە تێروانینی درێژی و دووربینی لەسەر بابەتە وردەکارییەکان هەبێت، بۆیە هەرکاتێك ڕێبەرەکە پێشەکیەکەی کەم بێت یان ڕوون و ئاشکرا بێت، دڵی بەمە خۆش نابێت.. هەندێك لە خەڵکی گەر بزانن ئەوەی ئەوان دەیزانن خەڵکی عەوامیش دەیزانێت، واتە ئەوانەی نازیرەکیشن دەیزانن، ئەوا هیچ شتێکی لە زانست لای خۆی نییە کە خۆی پێ لەوان جیا بکاتەوە، بۆیە حەزدەکات بابەتە شاراوە و پڕ وردەکاریی و پێشەکییە زۆرەکان بزانێت".

لە کۆتاییدا..

تەنیا یەك خەتمی دروستم پێ بدە ..

موسڵمانێکی پاك و دروست و سوننی و سەلەفیت پێ دەدەم..

واز لە کتێبە فکیرییە درێژداڕییەکان بێنە، با قورئان ببێتە "یەکەم" و کتێبەکانی تر ببنە "پاشکۆ".

## ● لە لۆژیکیەکانی وردبوونەوە و سەرنجدان لە قورئان:

زۆرێك لە خەڵك پرسیار دەکەن و دەڵێن "بە دیاریکراوی وردبوونەوە و سەرنجدان (التبدر)م لە قورئان لە چ شتێك بێت؟" لە ڕاستیدا قورئان چەند ڕاستی و ئاماژەیەکی زۆری تێدایە کە پێویستیان بە تێرامان و سەرنجدان و وردبوونەوەیە لێیان، کلیلێکی زۆری تێگەیشتن لە قورئان هەیە.

لە گەورەترین کلیلەکانی سوودوەرگرتن لە قورئان، وردبوونەوە و سەرنجدانە لەوەی قورئان لەبارەی (ڕاستییە زانستییەکانی خوای گەورە) خستۆتیە ڕوو، ئەوەی لە قورئان هەیە لە وێناکردن لەبارەی (الملأ الأعلی) لە گەورەترین ئەو شتانەیە کە تەزیکەی نەفس دەکەن، زۆرێك لە کەسانی خاوەن بیری سەردەم وا بۆی دەچن کە گرنگترین شت لە قورئان بریتییە لە (تەشریعاتە کردارییەکان)ـە، بەڵام زانستی ئیلاهی پرسێکی لاوەکییە، نازانن کە ئەمە مەبەستە گەورە و سەرەکییەکە. بۆیە پێشەوا ئیبن تەیمیە دەڵێت "گوتاری زانستی لە قورئان لە ڕووی ڕێز و وەسفەوە لە گوتاری کرداری کردداری شەرەفمەندترە". {درء التعارض ٥/٣٥٨}.

من هەر کاتێك کەسایەتییەکی ڕۆژئاوایی بەتوانا لە ڕووی فیکر و یاسا و زانستەکانی تر دەبینم، بەزۆر هەوڵدەدەم کە ڕێز لە تواناکەی بگرم، چونکە من هەرکاتێك دەیانبینم کە لەوپەڕی نەزانینن بەرامبەر خوای گەورە، دڵم بەرامبەریان پڕ دەبێت لە بێزاری. ئاخر چ سودی هەیە تۆ وردەکاری بەشێکی دیاریکراو لە زانستەکان بزانیت لەکاتێکدا تۆ بەرامبەر گەورەترین داواکراو کە لە مرۆڤ داواکراوە نەزان بیت.. هیچ جیاوازی نییە لەگەڵ شۆفێری کامبیۆنێك کە وردەکاری هەندێك لە ڕێگا لاوەکییەکانی دەزانێت، بەڵام بە ڕێگای سەرەکی شارەکە نەزان بێت، ئایا نمونەی ئەم شۆفێرە دەگاتە شوێنی خۆی؟ !دەبێ ئەم جۆرە کەسانە لە چ جۆرە دواکەوتوویی و سەرلێشوایی نەزانین بە زانستی خوایی (ئیلاهی) بژین؟

جێگای داخە کە زۆرێك لە خاوەنبیرە عەرەبەکانی سەردەمیش بە وردەکاری زانستی خوای گەورە کە قورئان دەیخاتەڕوو نەزانن.. بەڵام پێشەویانی پێشین ئەوانەی ئێمە زانستی شەرعیمان لێ بە میرات وەرگرتوون، لە لوتکەی ڕۆچوون بوون بە وردەکارییەکانی قورئان، ئەوەی بیربکاتەوە– بۆ نمونە -لە پەیامی پێشەوا ئەحمەد لە وەڵامدانەوەی بێ بڕاوکان، یاخود پەیامی (رسالة الدارمي في النقص على المريسي)،

توشی سەرسامی دەبێت بەرامبەر ئەو قوڵبوونەوەی ئەوان هەیان بووە بە زانستی قورئان و نهێنییەکانی زانیاری ئیلاهی، زانینی ئەوان بە قورئان هەمەلایەن بووە، دەیانبینی کە سەرنجی واتاکانی قورئان دەدەن، لە راپۆرتەکانیان هاوسەنگی ئەو واتا قورئانییانە پیشان دەدەن.

لە کلیلەکانی تری سوودوەرگرتن لە قورئان، وردبوونەوە و سەرنجدانە لە هەواڵی پێغەمبەران، کە قورئان گێراویەتیەوە لە چەند شوێنیکش دووبارەی کردۆتەوە. ئاشکرایە ئەو جۆرە هەواڵانە لەبارەی پێغەمبەران بۆ خۆشی و کات بەسەربردن نەگوتراون، بەڵکو نمونەن کە قورئان دەیەوێت لە ڕێگەیانەوە پەیامێك بۆ مرۆڤ بنێرێت، کە خوێنەری قورئان سەرنج دەدات لەوەی خوای گەورە بەو هەواڵانەی چی دەوێت؟ نمونەی تێگەیشتنی بەندایەتی پێغەمبەران ڕێگای مامەڵەکردنیان لەگەڵ پەروەردگار، وەك پێشەوا ئیبن تەیمیە دەفەرموێت "بێگومان قورئان هەواڵی لە بارەی دوعاکان و تەوبەکردن و داوای لێخۆشبوونی پێغەمبەران داوە". {تخليص الاستغاثة:١/١٦١ }.

دەبینی کە قورئان دووبارە و چەندبارەی چیرۆکەکانی قورئانی لە شوێنی جیاجیا کردۆتەوە، ئەمە تەنیا دووبارەکردنەوە نییە، بەڵکو لە هەر جارێکیان خوای گەورە دەیەوێت پەیامێك بگەیێنێت، هەندێك جاریش لە شوێنیك کە باسی دەکات ئاماژە بە بەشێك لە ڕووداوەکان دەکات کە لە شوێنەکەی تر باسی نەکردووە، وەك پێشەوا ئیبن تەیمیە دەفەرموێت "خوای گەورە چیرۆکی (قوم لوط) لەچەند شوێنێك لە قورئان باس کردووە، لە سورەتی هود، الحجر و العنكبوت، لە هەر شوێنێك لەمانە باس لە جۆرێك لەوشتە دەکات کە ڕوویداوە "{الرد على المنطقيين:٤٩٤}.

گرنگ لێرەدا ئەوەیە، وردبوونەوە و سەرنجدان لە هەواڵی پێغەمبەران، هەواڵی ستەمکاران، هەواڵی پیاوچاکان لە قورئان و هەوڵدان بۆ تێگەیشتنیان و شیکردنەوەی ئەو پەیامەی لەگەڵ خۆی هێناوە، لە گەورەترین کلیلەکانی سوودوەرگرتنن لە قورئان.

یەکێکی تر لە گەورەترین کلیلەکانی سوودوەرگرتن لە قورئان، مرۆڤ هەموو گوتارە فیکرییە سەردەمییەکان لەبارەی رابوون و شارستانی و پێشکەوتن و چاکسازی و پرشنگداری و ..هتد لەبەرامبەر خۆی دابنێ، هەموو ئەو پرسانەی ئەوان وای دەبینن کە پێوەری پێشکەوتنن..

پاشان کەسی خوێنەری قورئان سەرنج بدات لەو کردارە ئیمانیانەی کە قورئان وەك پێوەری پێشکەوتن و بەرەوپێشچوون خستۆتیە روو..

تەنیا بیربکەرەوە، چۆن خوای گەورە باسی ملکەچبوون و پیشتبەستن و دڵنیایی و دڵسۆزی وداوای لێخۆشبوون و تەسبیحات و ئارامگرتن و راستگۆیی و فەرمان بە چاکە و رێگریکردن لە خراپە ... چەندان شتی تر کردووە.

بەڵکو تەنانەن هەندێك لەو کردارانە لە حەفتا شوێن باسکراون..

ئینجا بەراوردبکە لەنێوان ئامادەیی ئەو پرسانەی باسمانکرد لە پەیام و گوتارە فیکرییەکان، دەبینی ئامادەییەکی لاواز و شەرمانەیان هەیە..

ئەمە چ ئیفلاسبوونێکە، کاتێك دەبینی ئەو کردارانەی خوای گەورە خۆشی دەوێن و چەندان جار دوپاتیان دەکاتەوە و دەیانکاتە پێوەری پێشکەوتن و مەزنی و رۆشنایی، لە بنی بنەوەی لیستەکەی گوتارە فکرییەکانی سەردەمە کە پێچەوانەی ئەهلی سونەتن..

ئەمە چ هیوابڕانێکی تەمەنە..

کاتێك قورئانخوێن بە وردی سەرنج دەدات کە چۆن خوای گەورە وەسفی قورئان دەکات بەوەی بریتییە لە رێنوێنی و بەڵگەی روون و روناکی، ئەوکات راستەوخۆ دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە نیازی خوای گەورە لە بەندەکانی لە قورئان بریتی نییە لە مەتەڵێك.. ئایا دەکرێت پەروەردگار پێشخستن (ئەولەویەت) بداتە ئەو پرسانەی کە گوتارە فیکرییەکان دەیڵێنەوە و پاشان لە قورئان شتێکی تر دووبارە بکاتەوە؟ !ئایا قورئان مرۆڤ لە نیازی خوای گەورە گومڕا دەکات؟ !خوای گەورە قورئانی لەمە بەدوور و پیرۆزگرتووە، بۆیە پێشەوا ئیمام ئیبن تەیمیە دەفەرموێت" بەوەی قورئان بە رێنوێنی دادەندرێت و خوای گەورە کردوویەتیە بەڵگەی روون بۆ مرۆڤ، لە ناویدا بەڵگەی وای تێدا باس دەکات کە سوودبەخشە بۆ تەواوی مرۆڤەکان " {الفتاوی:٩/٢١١ } .

ئەمە واتای وایە ئەوانەی خۆیان بۆ خوا یەکلاکردۆتەوە، خوای گەورە بە تێگەیشتنی زیاتری قورئان جیایان دەکاتەوە، بەجۆرێك نیشانە و بەڵگە و نهێنیی وایان بۆ ئاشکرا دەکات کە بۆ کەسی تر ئاشکرای

ناکات، ئەو دڵەی بە لەخواترسان ئاوەدان کرابێتەوە، شتێك دەبینێت دڵێکی تر کە خەیاڵپڵاو چاوی داپۆشییوە نایبینێت، لە خوا دەپاڕێینەوە پەردەی لێخۆشبوونمان بەسەردا بدات. پێشەوا ئیبن تەیمیە لە چەند شوێنێك لە کتێبەکانی ئاماژەی پێداوە، وەك دەفەرموێت "ئاشکرایە لە وردەکاریی ئایەتەکانی قورئان، ئەوەندە زانست و ئیمان هەیە کە پلەی هەندێك خەڵك بەسەر ئەویدا بەرز دەکاتەوە، ئەو قورئانەی کە خەڵك بە شەو و بەڕۆژ دەیخوێنێت، لە تێگەیشتنیدا پلەیان زۆر بەرز دەبێتەوە، بێگومان خوای گەورە پلەی هەندێك خەڵك بەسەر هەندێکی تردا بەرز دەکاتەوە".

یەکێکی تر لە کلیلەکانی سوودوەرگرتن لە قورئان، قورئانخوێن سەرجەم بڕیار و ئەحکامەکانی قورئان بهێنێتە بەرچاوی و کۆیانبکاتەوە، وەك نمونە وەریان بگرێت و پەندیان لێوەربگرێت، چونکە وەك قورئان دەفەرموێت ﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ الحشر: ٢١ واتە "ئێمە ئەم نموونانە دەهێنینەوە بۆ خەڵکی بۆ ئەوەی بیربکەنەوە و ژیرییان بخەنە کار و شوێن قورئانی پیرۆز بکەون".

لە سوڕەتی رومیش دەفەرموێت ﴿ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِى هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ﴾ الروم: ٥٨ واتە "سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە لەم قورئانەدا لە هەموو بابەتێك نموونەمان بۆ خەڵکی هێناوەتەوە".

خوای گەورە لە دووتوێی ئەم نمونە قورئانیانە چی دەوێت؟ ئەمە ئاسۆیەکی فراوانە بۆ وردبوونەوە و تێڕامان..

بێگومان ئاگادارییەکانی قورئان لەبارەی ڕێگا راستەکە، پاڵنەرێکی گەورەن بۆ تێڕامان و سەرنجدان لە قورئان.. بەڵام شتێکی تر لە بەرامبەر ئەو پرسەدا هەیە.. ئەوەیش ئەوەیە هەر کاتێك مرۆڤ بیر لە پێچەوانەی ئەو ڕێگا راست و دروستە بکاتەوە ئاستی دوودڵی بۆ زیاد دەبێت.. هەر کەسێك پشت لە وردبوونەوە و سەرنجدان لە قورئان بدات، ئەوا دیارە خوای گەورە ئەو پشتێکردنەی بۆ نوسیووە، چونکە خوای گەورە لە زانستی خۆی پێشووتر زانیویەتی ئەو مرۆڤە هیچ خێری تێدا بەدی ناکرێت، گەر خێری هەبووایە ئەوا خوای گەورە بۆ سوودوەرگرتن و سەرنجدان لە قورئان سەرکەوتووی دەکرد، قورئان ئەم واتایەمان بۆ روون دەکاتەوە بە فەرمایشتی پەروەردگار ﴿ وَلَوْ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ ۖ وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ

لَتَوَلَّواْ وَّهُم مُّعۡرِضُونَ ﴾ الأنفال: ٢٣ واته "خۆ ئەگەر خوا خێری تیادا بەدی بکردنایە، ئەوە وای لێدەکردن کە حەق و راستی ببیستن، خۆ ئەگەر حەقیشیان پێ ببیستنایە (کە ئامادەنین بۆ وەرگرتنی) ئەوە هەر پشت لە بەرنامەی خوا دەکەن لەکاتێکدا ئەوان هەمیشە نەیارن".

هەر کاتێك مرۆڤ خۆی بینی کە پشتی لە قورئان کردووە، یان پشتی لە هەندێك ماناکانی قورئان کردووە، با بیر لە فەرمایشتی خوا بکاتەوە ﴿ وَلَوۡ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمۡ خَيۡرٗا لَّأَسۡمَعَهُمۡۖ ﴾ هیچ بواری نامێنێت، لە ترسان وشك هەڵدەگەڕێت.

بەهەرحاڵ.. ئەم قورئانە کانیاوێکە مرۆڤەکان هەر کەسەو بەقەد پێگەکەی خۆی کێبڕکێیانە لە خواردنەوەی لێی، وەك پێشەوا ئیبن تەیمیە دەفەرمویت "ئەم قورئانە سەرچاوەیەکە بۆ گشت دروستکراوەکان، هەر کەسەو بە گوێرەی ئەو بەشەی خوای گەورە بۆی داناوە لەو سەرچاوەیە دەبات".

{التعارض:٧/٤٢٧}

..........................................................................

## • هەموو پەیڕەوەکە لە دایکی قورئان (أم الكتاب)ــە:

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ پێت دەڵێت کە گەورەترین سورەت لە قورئان سوڕەتی فاتحەیە. وەك لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە، ئەبی سەعید ئەلمعلی دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە، سوێندبەخوا سوڕەتێکت فێر دەکەم کە گەورەترین سوڕەتی قورئانە، (الحمد الله رب العالمين)، ئەو سوڕەتە بریتیە لە(سبع المثاني) و ئەو قورئانە گەورەیە کە بۆم دابەزیووە"{البخاري:٤٤٧٤}.

ئایا پێگەی سوڕەتی (الفاتحە) پێگەیەکی هەڕەمەکییە؟ ئایا خوای گەورە و میهرەبان ئەم سوڕەتەی کردۆتە گەورەترین سوڕەتی وەحی بە درێژای مێژووی پێغەمبەرایەتی، بیَ ئەوەی هیچ شتێکی بابەتی بوونی هەبێت کە پلەی یەکەم بداتە ئەو سوڕەتە؟ چەند کاتمان داوەتە ئەو سوڕەتە پیرۆزە بۆ بیرکردنەوە و سەرنجدان و وردبوونەوە لەو سوڕەتە لێی، هەروەها پرسیارکردن لەبارەی پیرۆزی ئیلاهی بۆ ئەو سوڕەتە؟

کاتێك خوێنەری قورئان لە ناوەڕۆکی ئەم سوڕەتە رادەمێنێت و سەرنج دەدات، ناتوانێت سەرسامی خۆی بشارێتەوە لەوەی کە چۆن خەڵکانی خاوەن بیروبۆچوونی دژ بە ئەهلی سوننەت ڕێگاکەیان لیَ ون بووە، بەتایبەت لە هەندێك پرسی بچوك و بابەتی تر کە کردوویەتیانە گەورەترین ئامانجی خۆیان. بیر لەو سوڕەتە بکەوە بەوەی چۆن بە سیَ ئایەت دەستپێدەکات کە هەموویان ستایشکردنی خوان و بە پیرۆزراگرتنی ئەو زاتەن بەوەی گەورەی هەموو جیهانیانە، پاشان پیرۆزراگرتنی بە بوونی رەحمەتی بێشوماری، دواتر پیرۆزراگرتنی بەوەی پادشای رۆژی دواییە.

قورئانخوێن لە سەرەتای سوڕەتی (الفاتحە) سوپاسی خوای گەورە دەکات کە پەروەردگاری جیهانیانە، لەبەرامبەردا پەروەردگاری جیهانیانیش وەڵامی دەداتەوە دەفەرموێت: (بەندەکەم سوپاسی کردم)، پاشان قورئانخوێن بەردەوام دەبێت ستایشی خوا دەکات بە رەحمەتە بێشوومارەکەی، پەروەردگاریش دەفەرموێت: (بەندەکەم ستایشم دەکات)، کاتێك قورئانخوێن دەگاتە ئایەتی سێیەم کە ستایشی خوا دەکات بە پادشای رۆژی دوایی، خوای گەورە دەفەرموێت: (بەندەکەم منی بەگەورە زانی). {صحيح مسلم٩٠٤}.

زۆرجار پرسیار دەکەم، ئایا ئێمە کاتێك (الفاتحە) دەخوێنین و بەو ئایەتانە تێدەپەڕین، هەست دەکەین کە خوای زەوی و ئاسمانەکان ئەوەمان پێ دەڵێت و بە زاتی گەورەیی خۆیی وەڵامی خوێندنەکەمان دەداتەوە، بەڵێ ئەمە خوایە، قسەمان لەگەڵ دەکات لە کاتێکدا ئێمە سورەتی (الفاتحە) دەخوێنێن، ئایا بیر لەمە دەکەیەوە؟

سوێندت دەدەم بەخوا، بیر لەو سێ ئایەتە بکەرە کە خوای گەورە لە فەرموودەی قودسی سەحیحدا باسی کردووە، ئەمە نیوەی (الفاتحە)یە، کاتێك دەفەرموێت (قسمت الصلاه بینی وبین عبدی نصفین) واتە "نوێژم لە نێوان خۆم و بەندەکەم کردۆتە دوو بەش".

ئەم سێ ئایەتە کە نیوەی سورەتی (الفاتحە)یە، واتە نیوەی گەورەترین سورەتە لە قورئان، هەمووی بریتییە لە سوپاس و ستایش و بەگەورەزانینی خوای گەورە.

بیربکەرەوە لەو سێ ئایەتە، پاشان مێشکت ببە لای ئەو مەزهەبە فیکرییەکانی سەردەم لەبارەی پرسی (ڕێکخستنی ئەولەویەتەکان) هەیانە..

بۆ خوا پرسیارت لێ دەکەم، ئایا هیچ لەو پێشخستنانە (ئەولەویەتانەی) ئەوان، باس لە ستایکشردن و ڕێزگرتن و پیرۆز ڕاگرتنی خوا دەکات، بەو پێیەی یەکێك بێت لە ڕیزبەندییەکانی ئەولەویەتەکانی چاکسازی؟ بۆ خاتری خوا هیچ یەکێکت لەوان بینیووە باس لە بونیاندنان و ئاوەدانکردنەی دەروونەکان بکەن بە گەورەزانینی خوای گەورە، بەو پێیەی یەکێك بێت لە ڕیزبەندییەکانی ئەولەویەتییەکانی ڕابوون و پێشکەوتن؟

کاتێك بیر لە نیوەی یەکەمی سورەتی (الفاتحە) دەکەمەوە و لەگەڵ بانگخوازەکانی ئەهلی سوننەت لەبارەی قسەی مەزهەبە فیکرییەکانەوە بەراوردی دەکەم، خەمبارییەك دام دەگرێت لەبەرامبەر ئەو مەزهەبە فیکرییانە، چۆن لەبارەی گەورەترین ئامانج سەریان لێ شێواوە، لە کاتێکدا هەندێکیان زیرەك و زرنگیشن، بەڵام دەروازەی ئەو پرسانە سەرکەوتنی خواییە، نەفسی مرۆڤ کاتێك شتێکی لوتبەرزی ڕۆشنبیری و زیرەکی بۆ دێت دەکەوێتە دوودڵی.

گەر ئەو سێ ئایەتەت تێپەڕاند و گەیشتیە ناوەڕۆکی سوڕەتەکە ﴿ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴾ الفاتحة: ٥ ، لێرەدا مەعمولی (إياك) کەوتۆتە پێش عاملی (نعبد) کە مەبەست لێرەدا (الحصر)ـە، هیچ خوایەك جگە لە الله ناپەرستیٚ، بەندایەتیکردن وشەیەکی گشتگیرە، کاتێك دەمت بەو رستەیە دەکەیتەوە کە لەدوو وشە تێپەڕ ناکات (إياك نعبد).. هەرچی پەراستراوی ترە جگە لە خوای گەورە لەبەرچاوت بزر دەبێت.

بیر لە گروپێك بکەرەوە کە ئەهلی هەمان قیبلەن بەلاّم داوای یارمەتی و پشتیوانی لە حوسێن دەکەن، ئەم ئایەتە دەلّێت داوای پشتیوانی لە حوسێن مەکەن جگە لە خوا نەبێت.

بیر لە مەزهەبێکی تر بکەرەوە  کە باس لە حوکم کردن دەکەن، بەلاّم ئەم ئایەتە پێیان دەلّێت جگە لە حوکمی خوای گەورە هیچ کەسێك مافی حوکم کردنی نییە.

بیر لە کەسانێك بکەرەوە کە هێندە ملکەچی هەوا و ئارەزووەکەیەتی وەك ئەوەی خوای بێت، بۆیە خوای میهرەبان دەفەرموێت ﴿ أَفَرَءَيۡتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ ﴾ الجاثية: ٢٣واتە "ئایا مەگەر نەتبینیوە ئەو کەسەی کە ئارەزوو هەوەسی خۆی دەکاتە خوای خۆی و شوێنی دەکەوێت؟!". ئەم ئایەتە دەلّێت جگە لە الله هیچی تر مەکەن بە خوا.

بیر لەو کەسایەتیانە بکەنەوە کە پلە و پایە و سەرەوت و سامان دەپەرستن، وەك پێغەمبەر ﷺ (تـَعِسَ عـبدُ الدنيار) واتە بەهیلاك چێت بەندەی پارەوپول. ئەم ئایەتە دەلّێت جگە لە الله بەندایەتی هیچ کەسی دیکە مەکەن.

بیربکەرەوە لەو کەسەی ملکەچی شەیتان بووە وەك ئەوەی دەیپەرستێت وەك پەروەردگار دەفەرموێت﴿ أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَ ﴾ يس: ٦٠ واتە "ئەی نەوەی ئادەم" مەگەر من پێم رانەگەیاندن کە شەیتان نەپەرستن".، هەروەها دەفەرموێت ﴿ يَٰٓأَبَتِ لَا تَعۡبُدِ ٱلشَّيۡطَٰنَ ﴾ مريم: ٤٤ واتە " ئەی باوکی ئازیزم !شەیتان مەپەرستە".

ئەم ئایەتە دەڵێت جگە لە الله ملکەچی کەسی دیکە مەبە.

بیر لەو حاڵەتانە دەکەمەوە کە دڵ تیایدا ستایشی خەڵك دەکات و پیایاندا هەڵدەڵێت..بەڵام ئەم ئایەتە پێت دەڵێت لە کارکردندا جگە لە زاتی خوا گەورە مەبەستی کەسی ترت نەبێت..

بیر لەو نیەتانە بکەوە کە لە خوا دوورکەوتونەتەوە بەرەو دونیا چوون.. بەڵام ئەم ئایەتە پێت دەڵێت نیەتت جگە لە الله بۆ کەس نەبێت..

بیر دەکەمەوە و بیر دەکەمەوە و بیردەکەمەوە...

ئەو ئایەتە پیرۆزە هەرچی پەرستراو و بەگەورەزانراوێك هەیە ڕەتی دەکاتەوە جگە لە الله نەبێت..

(إياك نعبد) بریتییە لە ناوەرۆکی پرۆژە چاکسازییەکە، بریتییە لە ڕێسای ڕابوون و ڕاپەرین، بریتییە لە تاقیگەی شارستانی، بریتییە لە پێوەری پێشکەوتن، بریتییە لە پلانی گەشەسەندن..

(إياك نعبد) بریتییە لە دڵی سوڕەتی (الفاتحە)، دڵی گەورەترین سوڕەتی کتێبەکەی پەروەردگارە، لەگەڵ ئەوەشدا چەندان ئومەت لەبەرامبەر ئەو سوڕەتە ڕێگایان لێ بزربووە، تەنانەت لەبەرامبەر ئەو دوو وشەیە..

ئایەتێك ڕۆژانە دەیان جار لە هەموو ڕکاتێك لە نوێژە فەرز و سوننەتەکاندا دووبارەی دەکەینەوە..

بۆچی..؟؟

چونکە "پێڕەوی ژیانە"..

بیر بکەرەوە کە چۆن پێشەوایانی دین لە وردەکاری بابەتەکان حوکم بەو ئایەتە دەکەن.. ئیبن تەیمیە دەفەرموێت "مەبەست لەوەدا ئەوەیە، گەر سەردانیکاری شەرعی (نوێژخوێن) گوتی ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾ ئەوە ڕاستگۆیە، چونکە جگە لە الله کەس ناپەرستێت و داوای پشتیوانیش جگە لەو لە کەسی دیکە ناکات، بەڵام سەردانیکاری بیدعە جگە لە الله دەپەرستێت و داوای پشتیوانی جگە لەو دەکات، ئەمە بەشێکە لەو بابەتەی ڕوونی دەکاتەوە کە سوڕەتی الفاتحە دایکی قورئانە (أم القران)".

داوای پشتیوانیکردن لە فەرمایشتی (إياك نستعين) گەرچی (إياك نعبد) ئەوەندە گشتگیرە ئەویش دەگرێتەوە، بەڵام خوای گەورە بە تەنیا باسی دەکات، بۆ ئەوەی ببێتە ئاگادارکردنەوەیەکی بەردەوام کە باوەڕدار بەبیری بێتەوە، کە داواکراوی یەکەم بریتییە لە بەندایەتیکردن (العبادە) کە جێبەجێ نابێت تەنیا بە دوای پشتیوانیکردن (الاستعانە) نەبێت، پرسی هاتنی (الاستعانە) لە دوای (العبادە) پرسێکە پێشەوایان لە بابەتە ئیمانییەکانیان بە درێژی باسیان کردووە.

پاشان سورەتەکە دەچێتە بەشی دووەمی کە خوای گەورە لە فەرموودەی قودسی پێشوودا باسی کردووە، لە دوای ستایش و یەکتاپەرستی حاڵەتی دوعاکردن دێت، خوای گەورە دەفەرموێت (هذا لعبدي ولعبدي ما سأل) واتە "ئەمە بۆ بەندەکەمە، بۆ بەندەکەم هەیە هەرچی دوای بکات".

باشە..

ئەو نزایە چییە کە خوای گەورە بۆ ئێمەی هەڵبژاردووە بۆ ئەوەی لێی بپاڕێینەوە؟؟

دواکارییەکان زۆرن، ئێمە ئێستا لە گەورەترین سورەتداین، ئەو شوێنەی کە خوای گەورە بۆ ئێمەی هەڵبژاردووە، وا ئێمەی گەیاندە شوێنی دوعاکردن، خوای گەورە بە زاتی خۆی ئەم نزایەی بۆ هەڵبژاردووین؟

ئایا دەزانی ئەوە نزایە چییە کە خوای گەورە بۆی هەڵبژاردووین؟

ئەوە (نزای هیدایەت و ڕێنوێنیە)..

گەر بە کەسێك بگوترێت: لە خوا بپاڕێنەوە کە هیدایەتت بدات، سەری سوڕ دەمێنێت، هەست دەکاتە ئەمە کارێکی زۆر سەرەکی نییە، بەڵام خوای گەورە بۆمان هەڵدەبژێرێت کە نزای (الفاتحە) نزای هیدایەت و ڕێنوێنی بێت!!

مادام خوای گەورە وای دانابێت کە دوعاکردنی گەورەترین سورەت لە قورئان "دوعای هیدایەت بێت" ئەمە واتای ئەوەیە کە گومڕابوون زۆرنزیك و مەترسیدار و توقێنەرە، ئەگەر نا خوای گەورە ئەو تایبەتمەندییە بەو دوعایە نەدەدا، چونکە گەر گومڕایی کارێکی دوور بوایە، یاخود بەو شێوەیە نەبایە کە

لێی بترسابایین، ئەوا خوای گەورە و بەخشەندەی میهرەبان کە خێری لە نەفسی خۆمان زیاتر بۆ ئێمە دەوێت، دوعای (الفاتحە)ی بۆ نەدەکردینە دوعای هیدایەت..

سەرنجی ئەو پلەیە بدە کە مرۆڤ داوای ڕێنوێنی و هیدایەت تیادا دەکات؟

ئەوە پلەی تاوانی نییە و پلەی گومڕاییش نییە..

بەڵکو ئەوە مرۆڤە پێداگیری دەکات لە داواکردنی هیدایەت و ڕێنویی لە خوای گەورە.. بەرامبەر خوا وەستاوە دوای هیدایەتی لێ دەکات!

چ بە حاڵی ئەو کەسەی گوێ بە خوا نادات؟

چ بە حاڵی ئەو کەسەی بێ ئاگایە لە خوا ؟

لەگەڵ ئەوەشدا داوای هیداتدان و ڕێنوێنیکردن لەسەرخۆی بە گەورە دەزانێت!

لە کاتە پیرۆزەکان، جگە لە دوعای پیرۆز نەبێت هیچی دیکە هەڵنابژێردرێت، پیرۆزترین دوعاش ئەوە دوعایە کە مرۆڤ لە دژەکەی بترسێت، گەر خوای گەورە "چەندبارەی داواکردنی هیدایەتدانی" لە پیرۆزترین سورەت بۆ هەڵبژاردبین، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دژی هیدایەت گومڕایە، گومڕاییش کارێکە زۆر نزیکترە لەو کڵاوەی لەسەری دەنێین.

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئێمە لەسەر کێڵگەیەکی پڕ لە مینی (لادان لە ڕێی ڕاست) دەڕۆین..

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ژیانی ئەم دونیایە پڕیەتی لە ناڕاستی کە ڕاست و چەپ مرۆڤ لە ڕێگەی دروست لادەدەن..

بۆیە بەخشندەی میهرەبان بۆی هەڵبژاردووین کە داوای هیدایەت و ڕێنوێنی لە هەموو ڕکاتی نوێژەکانمان لێ بکەین..

گەر دەبینی خوای گەورە بە چ ڕێگایەك هیدایەتدانی تایبەتکردووە، بە ڕێگایەکە کە دڵەڕاوێکمان بەرامبەر گومڕایی دەوروژێنێت.. ئینجا بەراوردی بکە بە فیکری ساردی ئەم سەردەمە بەرامبەر پرسی هیداتەدان و گومڕابوون، لەگەڵ مامەڵەکردنی ئێمە لەگەڵی کە هیچ جۆرە ترس و بیمێکی تێدانییە.

پێشەوا ئیبن تەیمیە دەفەرمویێت "خوای گەورە بۆیە ئەو دوعایە بۆ فەرزکردووین کە بە دووبارەکردنەوەی نوێژەکان دووبارە دەبێتەوە، بەڵکو لە هەموو رکاتێکی نوێژی فەرز و سوننەت دووبارە دەبێتەوە، دوعای "دایکی قورئان"ـە، کە دەفەرمویێت ﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴾ الفاتحة: ٦ ، بۆیە ئەو دوعایەی بۆ داناوین چونکە هەموو بەندەیەك ناچارە بۆ ئامانجی ئەو دوعایە، کە ئەویش بریتییە لە رێنوێنیکردن بۆ رێبازی راست و دروست کە ئیسلامە" {الفتاوی:٢٢/٣٩٩ }.

قورئانخوێن وشەی رێنوێنی و هیدایەت تێپەڕناکات، راستەوخۆ یەکەمین وێستگەکانی ئاماژەبەدان بە "ململانێ "دەست پێدەکات..

بۆیە خوای گەورە راستەوخۆ دوای ئەو وشەیە، ئاماژە بە شوێنی رێنوێنیکردن و هیدایەتدان دەدات، ئەویش" الصراط"ـە واتە تەنیا یەك رێبازە، هیچ رێباز و رێگایەکی تر نییە..

ئایا بەمە وازی هێنا ؟.. نەخێر.. بەڵکو وەسفی رێبازەکە دەکات بە" مستقیم "واتە راست و دروست..

ئەو رێباز و رێگایە هیچ خواروخێچییەك بەخۆی هەڵناگرێت.. هەر کەسێکیش لەو رێگایە لابدات، ئەوا لە ئیسلام دەرچووە، هەر کەسێکیش بچێتە ناو ئەو رێگایە بەڵام نەتوانێت بەردوامی هەبێت لەسەری، ئەوا ئەویش یەکێك دەبێت لە لادەرانی ئەهلی قیبلە..

وشەی" صراط "وەسفێکە بۆ ئیسلام..

وشەی" مستقیم "وەسفێکە بۆ رۆیشتن لەسەر سوننەت..

بەردەوامی و پابەندبوونیش وەسفێکە بۆ ئەو" صراط"ـە..

باشە.. خوای گەورە وەسفی شوێنی هیدایەتدانی کردووە، وەسفێکی تێوری کردووە بەوەی بریتییە لە "صراط مستقیم".

ئایا بەو ئەندازەیە وازی هێناوە؟ نەخێر..

بەڵکو زیاتر ڕوونی دەکاتەوە بەوەی گرێی داوە بە ئەزمونێکی دیاری مرۆڤایەتی، دەفەرموێت ﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ ﴾ الفاتحة: ٧ واتە" کە بەرنامە و ڕێبازی ئەوانەیە لە ناز و نیعمەتی خۆت بەهرەوەرت کردوون".

ئەو بەستنەوەیە بەراورد بکە بەوانەی دەڵێن ڕێگای هاوەڵانی پێغەمبەر و ئەوانەی دوایان کەوتوون بۆ ئێمە گرنگ نییە !خوای گەورە بۆمان روون دەکاتەوە کە ڕێبازی هاوەڵان ئەو ڕێبازەیە کە ناز و نیعمەتی (أنعمت عليهم) خۆی پێداون، گەورەترین توێژ کە بچێتە چوارچێوەی ئەو وەسفە خواییە، هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەرن (رەزای خوایان لەسەر بێت)، لە کاتێکیشدا ئەو خەڵکە دەڵێت ڕێگەی هاوەڵەکان بۆ ئێمە گرنگ نییە!

لە پاشان ئەو سورەتە کۆتایی دێت بە وێنەی لێکترازانی گەورە و شوێنکەوتەکانی، بە جۆرێك" صراط المستقيم "دەکەوێتە نێوان دوو ڕێگا، ڕێگایەك خوای گەورە خەشم و قینی لێگرتوون، کە بریتین لەوانەی زانستیان بە دەستهێناوە بەڵام پشتگوێیان خستووە، ڕێگای دووەم ڕێگای ئەوانەی سەرگەردان و گومڕابوون، کە بریتییە لە ڕێگای ئەوانەی تێکۆشانیان کردووە بەڵام بە بێ زانست.. بەڵام ئەهلی" صراط المستقيم "زانست و کرداریان بەیەکەوە کۆ کردۆتەوە..

ئینجا سەیرکە بزانە چۆن ئەم فاتحە گەورە و پیرۆزە ژیانی موسڵمان دروست دەکات، لە کاتێکدا موسڵمان هەموو ڕۆژێك دووبارەی دەکاتەوە..

........................................................................

## • سەدای شەوانی ڕەمەزان:

لەو یادەوەریانەی زۆرجار دێتەوە یادم، وێنەی شەوانەی یەکێك لە ئێوارانی ڕەمەزانە..

لە دیمەنەکانی شەوانی ڕمەزاندا، بەتایبەت لەم چەند ساڵەی دوایدا، مزگەوتەکان بە نوێژخوێنان پڕ دەبن بە تایبەت لە کاتەکانی تەوارویح و شەونوێژدا.. زۆرجار کاتێك لە ماڵەوە لە نوێژەکەت تەواو دەبی، بەڵام گوێت لە مزگەوتێکی نزیك دەبێت کە تا ئەو کاتە هەر لەناو نوێژدان..

بە دیاریکراوی ئەمە شەوێکیان بۆ من ڕوویدا، بەردەوام یادکردنەوەی لە مێشکم دایە.. شەوێکیان لە ژوورە تایبەتییەکەم بووم خەریکی کۆکردنەوەی هەندێ پەڕاو و کاغەز بووم، لەو ساتەدا، لە پەنجەرەی ژوورەکەمدا دەنگی مزگەوتی قورئانخوێن (خالد الشارخ) هاتە گوێم، ئەو مزگەوتەی گەنج و لاوان لە ڕۆژئاوای شاری (ریاز)ەوە ڕووی تێ دەکەن.

لە کارکردن وەستام..

پەنجەرەکەم کردەوە و شەویش تاریك بوو..

خەریك بوو بەرەو ئەو دەنگە دەفڕیم..

گەر هەڵە نەبم پێم وابێ ئایەتەکانی سوڕەتی (المائدە)ی دەخوێندەوە..

سوێند بەخوا وەك ئەوەی هەست بە ئارامی و ئاسوودەیی بکەم کە بە دەورم دا دادەبەزێت..

هەستم کرد کە هەوایەکە وەکو هەوای ئاسایی نییە..

ئاسمانەکە ئاسمانی ئاسایی نییە..

شتێك ڕوودەدات، هەر چی قاموسی دونیایە ئیفلاسی کردووە لەوەی بتوانێ یارمەتیم بدات بە دەستەواژەیەك کە گوزارشتی ئەو هەستەی خۆمی پێ بکەم..

ئەی خوایە.. قورئان چ کاریگەرییەك لە دەروونی مرۆڤایەتی دەکات..

هەر لەو شتانەی بە بیرم دێتەوە، کاتێك من بچووك بووم یەکێك لە کەسە نزیکە پیرەکانم دێتەوە یاد، هەرکاتێك لە نوێژی تەراویح لە مزگەوت بهاتبایەوە، ڕاستەوخۆ دەچووە بەرامبەر تەلەفزیۆن سەیری

نوێژی تەراویحی مزگەوتی حەرەمی دەکرد.. پێم ناژمێردرێت کە چەند فرمێسکی ئەو پیرەپیاوەم بینیووە لەبەرامبەر بینینی ڕیزی نوێژخوێنان بەرامبەر کەعبەی پیرۆز و گوێگرتنی قورئان دەیڕشتن..

لە چەند ڕۆژێکی بەر لە هاتنی مانگی ڕەمەزان، ئالۆگۆرکردنی پیرۆزبایی و دوعاکردن بە (اللهم بلغنا رمضان، وفقنا الله وإياك لصيام رمضان وقيامه) واتە خوایە بمانگەیێنە ڕەمەزان، خوا ئێمە و ئێوە لە گرتنی ڕۆژووەکانی ڕەمەزان و نوێژەکانی سەرکەوتوو بکات، هەروەها دەیانگوت، بە بۆنەی هاتنی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز، پیرۆزبایت لێ دەکەم، چەندان دوعای تر..

کاتێك هەندێك لەو پیرۆزبایانەم دیتن، هاتە مێشکم کە سەیری ئەوەبکەم چۆن خوای گەورە ڕەمەزانی بۆ ئێمە داناوە..

لە چوارچێوەی چ کارێکدا خوای گەورە ئەو مانگە پیرۆزەی بۆمان داناوە؟

بە واتایەکی تر: **ناسنامەی مانگی ڕەمەزان لە قورئان چییە؟**

کاتێك دەستم کرد بە بیرکردنەوە لەو ئایەتە قورئانیانەی باس لە ڕەمەزان دەکەن، بینیم بە دوو شێواز هاتوون، شێوازی یەکەمیان مانگی تەواوە (ڕەمەزان)، جۆری دووەمیان وەك بەشێك لەو مانگە ئەویش (شەوانی قەدرە).

لەو شێوازەی بە شێوەی مانگی تەواو هاتووە، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ ﴾ البقرة: ١٨٥ واتە "مانگی ڕەمەزان (ئەو مانگەیە) کە قورئانی تیادا هاتۆتە خوارەوە" خوای گەورە بۆمان ڕوونکردەوە کە ڕەمەزان لێرەدا ئاوەڵناوی کاتییە بۆ قورئان.

لەو شێوازەشی کە بەشێوەی بەشێك لە ڕۆژەکانی باس کراوە، بریتییە یەکێك لە شەوەکانی، ئەمیش بە دوو جار هاتووە، جارێکیان بەناوی شەوی قەدر (ليلە القدر)، جارێکیشان بە ناوی شەوی پیرۆز (الليلة المباركة). لەبارەی شەوی قەدر خوای گەورە لە سەرەتای سوڕەتی (القدر) دەفەرموێت﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ﴾ القدر: ١ واتە "ئێمە بەڕاستی قورئانمان دابەزاندۆتە خوارەوە لە شەوێکی بەفەڕ و ڕێزداردا".

لەبارەی ناوی شەوی پیرۆز خوای گەورە لە سەرەتای سوڕەتی (الدخان) دەفەرموێت ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٍ

مُّبَـٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ﴾ الدخان: ٣ واتە "ئێمە لە شەوێکی بەفەڕ و پیرۆزدا (کە شەوی قەدرە) ناردومانەتەوە خوارەوە، بەڕاستی ئێمە بێدارکەرەوەین (خەڵکی بەئاگا دەهێنین و هوشیاریان دەکەینەوە)".

لە هەردوو شوێندا خوای گەورە لە میانەی پەیوەندیی بە قورئانەوە باسی ئەو شەوە دەکات! (وەك پەیوەندی قورئان و رەمەزان)

لە هەردوو شوێن کە خوای گەورە باسی رەمەزانی کردووە، جا چ بە شێوازی مانگی تەواو بێت یان بە شێوازی بەشێکی (شەوەکانی) بێت، لە چوارچێوەی پەیوەندیبوون لەگەڵ قورئان باسی کردووە.

چ ئاماژەیەکی تایبەت بە قورئان لە رەمەزان لەمە روونتر هەیە ؟!

بچۆ هەموو مانگەکانی تر بهێنە.. مانگەکانی حەج، مانگە حەرامەکان، ئەو ئاماژە چڕوپڕەی بۆ پەیوەندیبوون بە قورئان لە مانگی رەمەزان هەیە لەو مانگانەدا نایانبینت.

لێرەدا شتێکی تر هەیە زیاتر جێگای سەرنج وتێڕامانە، کە تەنیا دابەزینی قورئان نییە کە خوای گەورە رەمەزانی بۆ هەڵبژاردبێ، بەڵکو (پێداچوونەوەی قورئانە) لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کە دیسان خوای گەورە رمەزانی بۆ هەڵبژاردووە. جوبرەئیل (سلاوی خوای لەسەر بێت) ((گەورەترینی فریشتەکانە چونکە خوای گەورە تایبەتی کردوە بە گواستنەوەی فەرمایشتەکان)) لە مەجلیسی شەوانەی هەموو رەمەزان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دادەنیشێت و پێداچوونەوەی قورئانی لەگەڵ دەکات، لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە کە ئیبن عەباس دەیگێڕێتەوە، کە دەفەرموێت "جوبرەئیل لە هەموو شەوانی رەمەزان پێغەمبەری دەبینی تا ئەو مانگە تێدەپەڕی، پێغەمبەر ﷺ قورئانی لەگەڵ دەخوێند "{البخاري:٤٩٩٧ }.

بۆچی خوای گەورە بە دیاریکراوی ئەو شەوەی بۆ پێداچوونەوی قورئان هەڵبژاردووە؟

ئایا ئەمە مانای ئەوە نییە کە کاتژمێرەکانی رەمەزان پیرۆزترین و شایەنترین کاتن بە قورئان؟ ئایا هیچ ئاماژەیەکی تر بۆ تایبەتمەندی قورئان لە رەمەزان زیاتر هەیە، لە هەڵبژاردنی کاتی دابەزینی قورئان و هەڵبژاردنی کاتی پێداچوونەوەشی؟

کێ بیر لە دیمەنی ئەم مەجلیسە دەکاتەوە..؟

مەجلیسی شەوانەی رەمەزان بۆ پێداچوونەوەی قورئان، لە هەردوو سەری ئەو مەجلیسە گەورەترین و پیرۆزترین مرۆڤ (محەمەدی کوڕی عەبدولاَ) و گەورەترین و پیرۆزترین فریشتە (جوبرەئیل) دانیشتوون.

بابەتی وانەکەش گەورەترین و پیرۆزترین فەرمایشتە (فەرمایشتی شای شاهانە)..

پاك و بێگەری بۆ خوای گەورە..

ئەمە چ شکۆییەکە بە بیرکردنەوەی ئەو دیمەنە دێتە سەر دەروونەکانمان..

بۆیە پێغەمبەر ﷺ خۆی زۆر بە خوێندنەوەی قورئانی رەمەزان لەگەڵ جوبریل کاریگەر دەبوو، تەنانەت هاوەڵە بەڕێزەکان شوێنەواری ئەو کاریگەربوونەیان بەروونی بەسەر کەسایەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبینی، تا ئەوەی ئیبن عەباس لە سەحیحی بوخاریدا دەفەرموێت پێغەمبەری خوا ﷺ دەستکراوەترین و سەخیترین کەس بووە، لە رەمەزان لەو کاتەی چاوی بە جوبریل دەکەوت سەخیتر دەبوو، بۆیە پێغەمبەر خوا ﷺ کاتێك چاوی بە جوبریل دەکەوت لە رووی خێرکردنەوە و بەخشینەوە لە هەڵکردنی (با) دەستکراوەتر بوو" {البخاري:٣٢٢٠ }.

سەیرکە چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ دەستکراوەی و بەخشندەیی بە پێداچوونەوەی قورئان لەگەڵ جوبریل زیادی دەکرد، ئەمە ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ بێت کە قورئان لەسەر خودی خۆی دابەزیووە، لەگەڵ ئەوەشدا بە پێداچوونەوە و خوێندنەوەی قورئان سوودی وەردەگرت، سوێندتان دەدەم بەخوا دەبێ حاڵی ئێمە چۆن بێت، ئێمەی خاوەنی ئەو دڵانەی کە هەوا و ئارەزوو و گومان نەخۆشی کردووە..؟!

ئەم چ بێ بەشبوونێکە، کە هەندێك کەس تێی کەوتوون، کاتێك وا خەیاڵ دەکەن کە ئەوان قورئان دەزانن و خوێندوویانەتەوە ئیتر پێویستیان بە بەردەوامی خوێندنەوە و سەرنجدان و تێڕامان و پێداچوونەوەی نییە، هەر چی لە قورئان دا هەیە پێشتر ئەوان زانیویانە!

گەورەترین چالاکی کۆمەڵایەتی مانگی رەمەزان بێگومان (نوێژی تەراویحە)..

ئا یا هیچ جارێك پرسیارت لە خۆت کردووە کە ئایا حکیمەت لە نوێژی تەراویح چییە؟

لێم گەڕێ با ڕوونتربم لەگەڵت، لە ڕاستیدا لەوانەیە پێشتر ئەو پرسیارەت نەکردبێ، بەڵام من جارێکیان چاوم بە فتواکانی ئەبو ئەلعباس ئیبن تەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) گێڕا کە دەفەرموێت" بەڵکو مەبەست لە تەراویح و قورئانخوێندن تیایدا، بۆ ئەوەیە موسڵمانان گوێبیستی فەرمایشتی خوای گەورە بن ."{الفتاوی۲۳/۱۲۲ }.

پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی عەقڵی ئەو زانایانەی بەو شێوەیە لێکردووە تا لە نهێنی شەریعەت بگەن...

گەر مرۆڤ سەرنج بدات لە پەیوەندی نێوان رمەزان کە کاتی ڕۆژووگرتنە لەگەڵ دابەزینی قورئان، شتێك دەبینی لە پەیوەندی نێوان ڕۆژی دووشەمە و قبوڵبوونی ڕۆژی سوننەت تیایدا. کە پێغەمبەر ﷺ لە سەحیحی موسلیم ئاماژەی پێ دەدات "لە پێغەمبەر ﷺ پرسیار کرا لە بارەی ڕۆژووی ڕۆژانی دووشەم، فەرمووی (لەو ڕۆژەدا لە دایك بووم، لەو ڕۆژەدا نێردراوم، لەو ڕۆژەشدا قورئان بەسەرمدا دابەزیووە". {مسلم:۲۸۰٤ }.

بۆ خاتری خوا سەرنج بدە لەو هێڵە هاوبەشە بەرزەی نێوان مانگی ڕەمەزان کە ڕۆژووبوون تیایدا واجبە و مانگی دابەزینی قورئانە، لەگەڵ ڕۆژی دووشەمە، کە ڕۆژووبوون تیایدا سوننەتە و ڕۆژی دابەزینی قورئانە..

ئایا ڕەوایە ئەو کاتە دیاریکراوانە هیچ نیشانەیەکی شەرعی و پەیامێك لەخۆیان هەڵنەگرن؟

بەڵکو لە ڕێکەوتە سەیرەکانی مێژوو، ناوبانگترین جیهادی پێشەوایانی پێشینان لە قورئان، تاقیکردنەوە دیارەکەی پێشەوا ئیمام ئەحمەدە لەهەمبەر پرسی قورئان، ئەم ڕووداوە عەقیدەیە قورئانییە وەك مێژوونوسان باسی دەکەن لە ڕەمەزان ڕوویداوە !(الذهبـي) دەڵێت "لە ڕەمەزان کارەساتەکەی پێشەوا ئەحمەد ڕوویدا، بە قامچی لێیدرا تا لەهۆش خۆی چوو"{أعلام النبلاء:۱۰/۲۹۲ }.

پاك و بێگەردی بۆ ئەوەی قورئانی لە ڕەمەزان دابەزاند و هەروەها پێشەوایانی پێشینانی بە جیهادکردن بۆ قورئان لە ڕەمەزان تاقیکردەوە !ئەمە تەنیا ڕێکەوتێکی مێژووییە بەڵام جۆرێك لە وانەی تێدایە.

گەر مرۆڤ هەوڵبدات بۆ ئەوەی سەرنج بدات لە نهێنی پەیوەندی نێوان رەمەزان و قورئان، یاخود کاتەکانی رۆژووگرتن و قورئان، تێدەگات کە دەکرێت ئەو پەیوەندییە ئەوە بێت کە رۆژوو نەفسی مرۆڤایەتی پاك دەکاتەوە و ئامادەی دەکات بۆ پێشوازیکردن لە قورئان، لە رۆژوودا نەفس بە هۆی وازهێنان لە خواردن ئارام و ئاسوودە دەبێت..

لێرەدا شتێکی تر روون دەبێتەوە، گەورەترین کارێك کە یارمەتیدەربێت بۆ تێگەیشتن و سەرنجدان لە قورئان، کەمکردنەوەی خواردن و شتە زیادەکانە..

بۆنمونە: خواردنی زیادە، زیاد تێکەڵاوبوون لەگەڵ خەڵك، زیاد سەیرکردن، زیاد گوێگرتن و تەنانەت زیاد سەیرکردنی ئینتەرنێت..

هەرکاتێك دیواری شتە زیادەکان رووخا، دیواری نێوان قورئان و دڵەکانیش دەروخێت..

بۆیە لە رەمەزان خواردن و خواردنەوە و سەرجێیی کردن بە رۆژ کەم دەبێتەوە، تێکەڵاوی و قسەکردنی بێ مانا لە شەوانەدا کەم دەبێتەوە، ئەوەیە مانگی رەمەزان..

..........................................

- **هێڵی ڕێکخەر و حەقیقەتە گەورەکەی کتێبی پەروەردگار:**

ئەمە کاغەزی لێکۆڵینەوە نییە، بابەتێکی ڕێکخراویش نییە، تەنانەت یاداشتێکی ئەدەبیش نییە، نەخێر هیچ لەمانە نییە، بەڵکو (ئەوە خۆمم)،
ویستم بۆ خۆشەویستانم و برایانم بە دیاری بخەم، ئەوەی لەبەر دەستتدایە وەك پەڕاوی "دانپێدانانە" لە دەفتەری نیگەرانیم هەڵدەدڕێتەوە...
ئەو داڕوخانە دەروونییە کە منی ڕامالیوە، بەرهەمی ئێستا نییە، بەڵکو چەند ساڵێکە بەسەرمدا زاڵ بووە، بەڵام کاریگەرییەکانی تا ئێستا لەناوەوەم هەر گەورەتر دەبێت..
ڕاستە زۆرجار بە هۆی زۆری کاروباری ڕۆژانەم ئەو پرسەم لە بیر دەچێ، بەڵام هەر کاتێك شەو هات و چوومە سەر جێگای خەوتن و سەرم لەسەر سەرین دانا، شریتی ئەو ڕۆژە دەگەڕێنمەوە و کڵپەی ئازار سەرلەنوێ بۆم دەژیێتەوە و پشکۆی داڕووخانم دەدەگیرسێت..
کارێکی گەورە و ئەولەویەتێکی مەزن هەیە کە پێویستە من پێی هەڵبستم، لەگەڵ ئەوشدا تا ئێستا کاتژمێرەکانی ڕۆژانەم تێدەپەڕێت بێ ئەوەی ئەو ئەرکە جێبەجێ بکەم، بۆچی ساڵ دوای ساڵ دەڕوا کەچی من لە جێبەجێکردنی شکست دەهێنم؟ بۆچی لە کاتێکدا ئامانجەکە لە پێش چاوم زۆر ڕوونە، لەگەڵ ئەوەشدا لە هەڵسان پێی شکت دەهێنم؟
هەر کاتێك بیر لە زۆرێك لە خەڵکی دەورووبەرم دەکەمەوە جگە لە دووریان لەو پرسە هیچی دیکەیان لێ نابینم، مەگەر خوا ڕەحم بکا..
لەو دانیشتنە کۆمەڵایەتیانە دادەنیشم هەمووی دوور لەو پرسە گرنگە دەڕۆن..
سەردانی یانەکانی ئینتەرنێت و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان (فەیسبوك و تویتەر)دەکەم، کە ڕۆژانە بە هەزاران کۆمێنت پڕ دەبن، زۆربەیان بە هەندێك بابەت سەرقاڵن و لە پرسە گرنگەکە دوورن، مەگەر خوا ڕەحم بکات..

چاو بە کتێبە فیکرییەکان دەخشێنم کە دەزگاکانی پەخش و چاپ بڵاویان دەکەنەوە لە پێشانگاکانی کتێب داندراون، بەڵام زۆربەیان لەبەرامبەر (پرسە گرنگەکە) چاویان داخراوە.

کاتێك هەموو ئێوارەیەك واقیعی رووداوی رۆژانەی خۆم دێنمە بەرچاوی خۆم، هەروەها واقیعی زۆرێك لە خەڵکانی دەوروبەرم، هەناسەی ئاخ و حەسرەت هەڵدەکێشم و تاڵییەکە دەچێژم..

پرسیار دەکەم: بۆچی؟ بۆچی هەموو ئەمە؟ کەی ئەم تراژیدیایە کۆتایی دێت؟

لێم گەڕێ با چیرۆکەکەت بۆ کورت بکەمەوە..

هەر جارێك بیر لە قورئان دەکەمەوە، هەست دەکەم من تا ئێستا لە ناوەرۆکی ویستی و داواکاری خوای گەورە دوورم..

ناوەندی قورئان کە پرسگەلێك لە خۆ دەگرێت هەست دەکەم لە نێوان من و ئەودا مەودایەکی زۆر دوورە..

خوای گەورە لە قورئان باس لە بابەتێکی زۆر دەکات..

خوای گەورە باس لە زاتی پیرۆزی خۆی بە سیفەتە جوانەکانی دەکات، لە قورئان باس لە دیمەنەکانی قیامەت دەکات لە بەهەشت و دۆزەخ و حەشر و...، باس لە هەواڵی پێغەمبەران و هەواڵی ستەمکاران و هەواڵی پیاوچاکان و هەواڵی ئوممەتەکان بەتایبەت بەنی ئیسرائیل دەکات، باس لە شەرعی کردارەکان لە عیبادەتکردن و مامەڵەکردن دەکات.. هتد، هێڵێك هەیە کە هەموو ئەو پرسانە بەیەکەوە دەبەستێتەوە، بابەتەکان لە قورئان هەمەجۆر دەبن، بەڵام ئەو هێڵە رێکخراوە هەر هەیە.. ئەو پرسەی قورئان لەبارەیەوە دەدوێت و هەموو شتێك بەو بەستراوەتەوە بریتییە لە (ئاوادانکردنەوەی دەروونەکان بە خوای گەورە)..

من بیرم دەکردەوە بۆ نموونە لە سەرەتاییەکانی قورئان، لە سورەتی (البقرة) چۆن خوا باسی سەرسامی فریشتەکان دەکات ﴿ قَالُوٓاْ أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ ﴾ البقرة: ٣٠ واتە "فریشتەکان وتیان: ئایا کەسێکی تیادا دەکەیتە جێنشین کە خراپە و تاوانی تیادا بچێنێت و خوێنرێژیی تیادا ئەنجام بدات؟!". پاشان خوای گەورە پیرۆزی خۆی لایان گەورە کرد و زانستیش هەر بۆ ئەوە ﴿ قَالَ

﴿ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٠ ﴾ البقرة: ٣٠ واتە "خوا فەرمووی: بێگومان ئەوەی ئێوە نایزانن من دەیزانم".

من بیر دەکەمەوە کە چۆن خوای گەورە لە دوای ئەو ڕووداوە لە سورەتی (البقرە) ناز و نیعمەتەکانی خۆی بەسەر نەوەکانی ئیسرائیل لە شەش ئایەت دەژمێرێت، لەو ئایەتانە ئەوەی تێدایە کە لەسەر خەڵکی جیهاندا ڕێزیان پێدراوە، لە بنەماڵەی فیرعەون ڕزگاری کردوون، دەریایان بۆ شەق کردوون و بنەماڵەی فیرعەونیشی نغرۆ کردووە، دوای ئەوەی گوێرەکەیەکیان کردە خوای خۆیان لێیان خۆش بوو، پاشان دوای ئەو لیستە سەرسامییەی ناز و نیعمەتەکان، بەیەك کار کۆتایی پێ دێنێت ﴿ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴾ البقرة: ٥٢بۆ ئەوەی سوپاس گوزار بن.

لە هەموو ئەو بابەتەدا دەیەوێت دەروونەکان بە خوای گەورە ئاوەدان بکرێنەوە و زمان دڵەکان بە یاد و سوپاسی پەروەردگار بەردەوام بن..

خوای گەورە هەر لە (البقرە)دا– لە چەند شوێنی تریشدا دووبارەی دەکاتەوە -کە چۆن شاخی لە ڕەگوڕیشە دەرکێشاوە و بردویەتیە سەر سەری نەوەکانی ئیسرائیل، ئەمە بۆچی؟ بۆ ئەوەی بە دینداری و پەیوەست بوون بە خواوە پەروەردەیان بکات، خوای گەورە لە (البقرە) دەفەرمویێت ﴿ وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَكُمۡ وَرَفَعۡنَا فَوۡقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم بِقُوَّةٍ ﴾ البقرة: ٦٣ واتە "کاتێك پەیمانمان لێوەرگرتن (کە پەیڕەوی تەورات بکەن) و کێوی گورمان بەڕاسەرتانەوە ڕاگرت و پێمان وتن: ئەو بەرنامەیەی پێمانداون بە توندی بیگرن". لە شوێنێکی تر دەفەرمویێت ﴿ وَإِذۡ نَتَقۡنَا ٱلۡجَبَلَ فَوۡقَهُمۡ كَأَنَّهُۥ ظُلَّةٞ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُۥ وَاقِعُۢ بِهِمۡ خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم بِقُوَّةٍ ﴾ الأعراف: ١٧١ واتە "یادی ئەو کاتەش بکەرەوە کە کێوی گورمان لەجێی خۆی هەڵکەند و لە شوێنی خۆی بەرزمان کردەوە بەسەریاندا وەکو پەڵەهەورێك، جا ئەوکاتە (بەتەواوی ترسیان لێنیشت و) وایانزانی کە دەکەوێت بەسەریاندا، (ئەوسا پێمان وتن) دە ئیتر ئەوەی پێمان بەخشیوون بەتوندی بیگرن و لە سنوور دەرمەچن".

هەموو ئەوە بۆ بونیادنانی دەروونە بە دەستگرتن بە فەرمایشتی خوای گەورە ﴿ خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم بِقُوَّةٍ ﴾

بیر دەکەمەوە کە چۆن قورئان حاڵەتی ئەو دڵانەمان بۆ وەسف دەکات کە کانیاوی ئیمان تیایاندا وشك بووە و لە پەیوەستبوون بە خواوە پچڕاون. تا ئەو ئەندازەیەی خوای گەورە بە بێ گیانە وشکهەڵاتووەکانیان بەراوردیان دەکات کە نیگەرانی و خەفەت لێیان بزر نابێت.. دەفەرموێت ﴿ ثُمَّ قَسَتۡ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ فَهِيَ كَٱلۡحِجَارَةِ أَوۡ أَشَدُّ قَسۡوَةٗۚ ﴾ البقرة: ٧٤ واتە "پاشان لەوەودوا دڵەکانتان ڕەق بوو، هەر وەك بەرد، بەڵکو ڕەقتریش". دواتر ئەو بەراوردکردنە شەرامەزارییە تەواو دەکات ﴿ وَإِنَّ مِنَ ٱلۡحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنۡهُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ ﴾ البقرة: ٧٤ واتە "بەڕاستی بەرد هەیە ڕووباری لێ هەڵدەقوڵێت". تەنانەت بەرد نەرم دەبێت و ملکەچ دەبێت و دەتەقێت و وردوخاش دەبێت و دەکەوێتە خوارەوە.. ئەم نمونەیە لە پێناو چی؟ لە پێناو ئاوەدانکردنەوەی دەروونەکانە بە خوای گەورە ﴿ وَإِنَّ مِنۡهَا لَمَا يَهۡبِطُ مِنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِۗ ﴾ واتە "بەرد هەیە لە ترسی خوا لە لوتکەی شاخەکان بەر دەبێتەوە".

بیر دەکەمەوە کە چۆن خوای گەورە هەندێك لە بەندەکانی بە چەند شتێك تاقیکردەوە کە لەگەڵ حەز و ئارەزووەکانیان بگونجێت، بە هەندێك شتی تریش کە پێچەوانەی حەز و ئارەزووەکانیانە، هەندێك لە مرۆڤەکان بەوەی لەگەڵ حەز و ئارەزووەکانیان گونجاوە باوەڕیان هێناو و ئەوی تریان جێهێشت، قورئان ناڵێت خوای گەورە چاپۆشی لێکردوون لەوەی کردوویانە، نەخێر.. پەروەردگار دەیەوێت دەروونەکان بە خوا ئاوەدان بکاتەوە، ئەو کات بۆ خوا ملکەچ و گوێڕایەڵ دەبن ﴿ أَفَتُؤۡمِنُونَ بِبَعۡضِ ٱلۡكِتَٰبِ وَتَكۡفُرُونَ بِبَعۡضٖۚ ﴾ البقرة: ٨٥ واتە "کەوابوو چۆن دەبێت باوەڕتان بە بەشێکی (تەورات) هەبێت و بە بەشێکی تری باوەڕتان نەبێت؟". پاشان لە چەند ئایەتێکی دواتریدا ﴿ أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمۡ رَسُولُۢ بِمَا لَا تَهۡوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ

﴾ البقرة: ٨٧ واتە "ئایا چۆن دەبێت هەر کاتێك پێغەمبەرێکمان رەوانە کردبێت، بەڵام لەگەڵ ئارەزووەکانی ئێوەدا نەگونجا بێت، خۆتان بەزل زانیوە و لووتتان بەرز کردۆتەوەو بڕواتان نەهێناوە".

بۆ چی خوای گەورە بە ناشیرینی ناویان دەبات؟

چونکە مەبەستەکە لێرەدا شتێکی ترە..

کە زۆر جیاوازترە لەو شتەی زۆرێك لەوانەی مێشکیان بە (رۆشنبیری ماددی رۆژئاوایی) زیانی بەرکەوتووە.

مەبەستەکە ئاوەدانکردنەوەی دەروونە بە پیرۆزی خوا و خۆبەدەستەوانی یەکجاری بۆ ئەو زاتە...

بیر دەکەمەوە لەوەی چۆن خوای گەورە باس لە (النسخ – سڕینەوە) لە قورئان دەکات، ئەمەیان بابەتێکی هاوبەشە لە نێوان بنەماکانی فیقھ و زانستەکانی قورئان، پاشان بە روونکردنەوەی بەڵگەیەکی ئاشکرای شەرعی کۆتایی بەمە دەهێنێت، ئەویش ئاوەدانکردنەوەی دەروونەکان بە پیرۆزراگرتنی هێز و توانای خوایی ﴿ مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ۗ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾ البقرة: ١٠٦ واتە "هەرئایەتێك بسڕینەوە، یان بیخەینە بارودۆخی فەرامۆشییەوە و پشتگوێی بخەین، چاکتر لەو، یان وێنەی ئەو دەخەینە ڕوو، مەگەر نەتزانیوە کە خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە؟".

پاك و بێگەری بۆ ئەو خوایە..

بابەتێکی ئسولّییە و دڵەکان لە ڕێگەی ئەوەوە دەبەستێتەوە بە گەورەیی و هێز و توانای خوا..

بیر دەکەمەوە چۆن خوای گەوەر باس لە چەند بابەتێکی پەیوەندیدار بە مەرجەکانی نوێژ دەکات بۆ نمونە (روو لە قیبلەکردن)، کە چۆن لە قودسەوە گۆڕی بۆ کەعبە، سەرباری ئەوەی ئەمە بابەتێکی فیقهییە و هیچی دی، بەڵام قورئان ئاگادارمان دەکاتەوە کە ئەرکی ئەو ڕووداوە مێژووییە هەمووی بریتی بووە لە "تاقیکردنەوەی" دەروونەکان لەوەی ئایا چەند خوای گەورە بە پیرۆز رادەگرن و فەرمانبەرداری دەبن؟

بەڵێ ئەمە ناوەرۆکی بابەتەکە ﴿ وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِى كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ

عَلَىٰ عَقِبَيۡهِ ﴾ البقرة: ١٤٣ واتە "ئەو قیبلە و ڕووگەیەش رووت تێکردبوو(کە بیت المقدس بوو) گۆڕانکاریشمان بەسەردا هێنا تەنها بۆ ئەوە بوو بزانین و دەربکەوێت، کێ شوێنکەوتەی پێغەمبەردەبێت و کێش پاشەو پاش هەڵدەگەڕێتەوە".

ئایەتەکانی تۆڵەسەندنەوە بە "تەقوا و لەخواترسان" کۆتایی پێ دێت.. وەك دەفەرموێت ﴿ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡقِصَاصِ حَيَوٰةٞ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴾ البقرة: ١٧٩ واتە "ئەی هۆشمەندەکان ژیانتان تەنها لە تۆڵەسەندنەوەدایە (لەو کەسانەی خەڵکی بەناحەق دەکوژن)، بۆ ئەوەی تەقوا و لە خوا ترسان ببێتە پیشەتان و خۆ لە دەستدرێژی و تاوان بە دوور بگرن".

ئایەتەکانی رۆژوو دیسان بە "تەقوا و لەخواترسان" کۆتاییان دێت.. وەك دەفەرموێت ﴿كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴾ البقرة: ١٨٣ واتە "ڕۆژووی ڕەمەزان لەسەرتان پێویست کراوە هەر وەکو لەسەر گەلانی پێش ئێوە پێویست کرابوو، بۆ ئەوەی خواناسی و پارێزکاری بکەن".

ئایەتەکانی وەسیەت و میرات بە "تەقوا و لەخواترسان" کۆتاییان دێت.. وەك دەفەرموێت ﴿إِن تَرَكَ خَيۡرًا ٱلۡوَصِيَّةُ لِلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَ بِٱلۡمَعۡرُوفِۖ حَقًّا عَلَى ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾ البقرة: ١٨٠ واتە "گەر کەسێك سامان و ماڵ و داراییەکی بەجێ دەهێشت، با وەسیەت بکات کە هەندێکی بدرێت بە دایك و باوکی و خزمانی بەشێوەیەکی جوان و لەبارو ئەمە پێویست و ئەرکە لەسەر خواناس و پارێزکاران".

کاتێك خوای گەورە باسی مەراسیمی حەج و ئەرك و شەعایرەکانی دەکات، لە ساتی کۆتایی هاتنی ئەو مەراسیمەدا، سەلەرنەوێ بابەتی بەندایەتیکردنەکە دووبارە دەکاتەوە بۆ بەستنەوەی دەروونەکان بە خوای گەورە و زیندووکردنەوەی ئامادەیی خوایی لە دڵەکان ﴿ فَإِذَا قَضَيۡتُم مَّنَٰسِكَكُمۡ فَٱذۡكُرُواْ ﴾ البقرة: ٢٠٠ واتە "جاهەر کاتێك ئەرك و مەناسیکەکانتان بەجێ هێنا، ئەوکاتە یادی خوا بکەن".

چەند سەیرە.. بە تەواوبوونی مەناسیکی حەج ئەو ماندووبوونیەی موسڵمان تیایدا دەیبینین، جارێکی دیکە دەبێت دڵەکە بە خوای گەورە ببەسترێنەوە، ئەمە سەرباری ئەوەی حەج خۆی لە خۆیدا لەسەر بنەمای تەلبیە و زیکر و تەکبیر بونیادنراوە، بۆیە دڵ لە قورئاندا هەر بە خوا دەست پێدەکات و بۆ لای خواش کۆتایی پێ دەهێنێت..

بیر دەکەمەوە کاتێك خوای گەورە لە قورئان باسی حوکمی سوێندخواردن دەکات (الإيلاء)، دەربارەی ئەوانەی سوێند دەخۆن کە لە خێزانەکانیان نزیك نەبنەوە. خوای گەورە دوو هەڵبژاردن بۆ پیاو دادەنێت: یان ئەوەتا چوار مانگ چاوەڕێ بکات، یاخود تەلاقی بدات، سەرسام بووم، چۆن هەموو ئەو هەڵبژاردنانە فیقهیانە بە سیفەتە پیرۆزەکانی ئیلاهی کۆتاییان دێت، خوای گەورە لە دوو ئایەتەی دوای یەك دەفەرموێت ﴿ لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِن فَآءُو فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢٦﴾ وَإِنْ عَزَمُوا۟ ٱلطَّلَٰقَ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ البقرة: ٢٢٦ - ٢٢٧ واتە "بۆ ئەوانەی کە سوێند دەخۆن نزیکی هاوسەریان نەکەون، بۆیان هەیە تا چوار مانگ چاوەڕوانی بکەن (دەبێت لەو ماوەیەدا بڕیاری یەکجاری بدەن)، خۆ ئەگەر ئاشت بوونەوە و ڕێککەوتن، ئەوە خوا لێخۆشبوو و میهرەبانە (٢٢٦) خۆ ئەگەر سوور بوون لەسەر تەلاق دانیان، ئەوە بەڕاستی خوا بیسەری(بڕیاریانە) و زانایە (بە نیەتیان)".

سوێند بەخوا سەیرە، لە نمونەی وردەکای حوکمی فیقهی لەو شێوەدا دەروونەکان بە خوای گەورە ببەسترێنەوە.

بیر دەکەمەوە کە چۆن خوای گەورە باسی حاڵەتی "ترس" لە دوژمن دەکات، لەو حاڵەتە پڕ ترسەشدا نوێژکردن ناوەستێت، بەڵکو خوای گەورە لەم جۆرە حاڵەتە قورسانەشدا فەرمان بە ئەنجامدانی دەدات. ﴿ حَٰفِظُوا۟ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُوا۟ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا ﴾ البقرة: ٢٣٨ - ٢٣٩واتە "کەمتەرخەمی مەکەن و پارێزگاری لە ئەنجامدانی نوێژەکاندا بکەن بەتایبەتی نوێژی ناوەند(کە نوێژی عەسرە) هەمیشە و بەردەوامیش هەستن بە ئەنجامدانی فەرمانەکان بۆ خوا

بەگەردن کەچیەوە (٢٣٨) ئینجا ئەگەر ترسان (کە نوێژەکەتان وەکو پێویست ئەنجام نەدەن بەهۆی جەنگ یان مەترسیەکەوە) دەتوانن بەدەم ڕۆیشتنەوە یان بە سواریی ئەنجامی بدەن".

باشە ئەمە لە حاڵەتی ترسدا، ئەی لە حاڵەتی همێن و ئارامیدا چی؟ ئایەتەکە تەواو بکە ﴿ فَإِذَآ أَمِنتُمۡ فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمۡ تَكُونُواْ تَعۡلَمُونَ ﴾ واتە "هەرکاتێك ئەمین بوونەوە و هەستتان بە هێمنی کرد، ئینجا یادی خوا بکەن و (نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن) بەو شێوەیەی کە فێری کردوون پێشتر نەتاندەزانی".

جارێکی تر دەگەڕێمەوە سەرەتا ئایەتەکە بیر لە دەرەنجامەکە دەکەمەوە، کە لە هەردوو حاڵەتی ئاسایشی و ترسدا، پێویستە دڵ ببەسترێتەوە بە خوای گەورە.. توخوا جارێکی تر ئایەتەکە بەیەکەوە بخوێننەوە ﴿ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ فَرِجَالًا أَوۡ رُكۡبَانًاۖ فَإِذَآ أَمِنتُمۡ فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ ﴾ البقرە:٢٣٩ .

قورئان دەیەوێت دەروونی مرۆڤ لە هەموو حاڵەتێکدا بە توندی بە خوا بەسترابێتەوە..

لە کەسی موسڵمانی دەوێت لە هەموو جوڵە و وەستانێك خوای گەورەی لا هەبێت..

بیر دەکەمەوە چۆن خوای گەورە باس لە سەرکەوتنی سەربازی دەکات، ئەمەش دیسان بۆ بەستنەوە دەروونەکان بە خوای گەورە ﴿ وَلَقَدۡ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدۡرٖ وَأَنتُمۡ أَذِلَّةٞۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴾ آل عمران: ١٢٣.واتە "بێگومان خوا لە غەزای بەدردا سەرکەوتوی کردن، هەرچەندە ئێوە (لە ژمارە و چەکدا) لاوازو کەم بوون، دەی کەواتە لە خوا بترسن، بۆ ئەوەی سوپاسگوزار بن".

تەنانەت کاتێك خوای گەورە باسی تاوان و هەڵەکانی ئادەمیزاد لە قورئان دەکات، دەرگای یادکردنی خوا دەکاتەوە ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ ﴾ آل عمران: ١٣٥ واتە "ئەوانەش کە تاوان یان گوناهێك ئەنجام دەدەن، یاخود ستەم لە خۆیان دەکەن (دوایی بە خۆیاندا دێنەوە) خوا دێتەوە یادیان".

خوای گەورە باس لە ئاڵوگۆڕکردنی تەرازووی هێز دەکات بە درێژایی مێژوو، ئەم بابەتەش دەبەستێتەوە بەوەی مەبەست لێی تاقیکردنەوەی قوڵی باوەڕ و پەیوەستبوونە بە پەروەردگار﴿ وَتِلۡكَ ٱلۡأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا

بَيْنَ ٱلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَآءَ ﴾ آل عمران: ١٤٠ واته"ئێمه ئەو ڕۆژگارانه دەستا و دەست پێ دەکەین لەناو خەڵکیدا (تا له جیهانی واقعیشدا) ئەوانەی باوەڕیان هێناوه خوا دەریان بخات و هەندێکتان بکات به شایەت و به پلەی شەهیدی بگەن".

خوای گەوره له قورئان چیرۆکی دەستەیەك دەگێڕێتەوه که لەگەڵ پێغەمبەرەکەیان شەڕیان کردووه، قورئان باسی جێگریی و دامەزراوەییان دەکات.. لەوەش خۆشتر باس لەو قسەیان دەکات له میانەی شەڕکردنیان گوتوویانه.. که هەمووی ڕازونیاز گۆڕینەوه و پەیوەستبوونی دڵه به پەروەردگار ﴿ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَـٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُوا۟ لِمَآ أَصَابَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُوا۟ وَمَا ٱسْتَكَانُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِىٓ أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿١٤٧﴾ ﴾ آل عمران: ١٤٦ - ١٤٧ ، واته "چەندەها پێغەمبەر هەبوون که خواناس و پیاوچاکانی زۆر لەگەڵیدا بوون و دژ به دوژمنان جەنگاون، جا ئەوانه هیچ کات سستی و بێزاری و بێتاقەتی ڕووی تێنەکردوون بەهۆی ئەوەی که تووشیان هاتووه له پێناو ڕێبازی خوادا، لاوازو بێ هێزو سەرشۆڕیش نەبوون بۆ دوژمنان، خوای گەورەش ئەو ئارامگرو خۆڕاگرانەی خۆشدەوێت (١٤٦) ئەوکاته گوفتاریان تەنها ئەمه بووه که وتویانه: پەروەردگارا له گوناهو هەڵەکانمان ببورەو له زیادەڕەوی کاروبارمان خۆش ببه، دامەزراومان بکه، سەرمان بخه بەسەر ئەم گەله بێباوەڕەدا".

سوێند بەخوا سشتێکی سەیره له حاڵی ئەو دەستەیەی که خوای گەوره له میانەی ستایشکردنیان له قورئان باسی کردوون.

لەناو جەرگەی شەڕدا، دەیانبینی داوای لێخۆشبوون له گوناهەکانیان دەکەن، لێی دەپاڕێنەوه، پێویستی و کەمتەرخەمی خۆیان دەردەخەن..

ئای لەو دڵه بەستراوەنه بەخوای گەوره..

کاتێك خوای گەوره باسی جیهادکردن دەکات، ئەرکی جیهاد ڕوون دەکاتەوه، بەوەی که بریتییه له تاقیکردنەوەی ئەو شتەی له دڵەکاندایه بەرامبەر پەیوەستبون و باوەڕبوونیان بەخوا ﴿ قُل لَّوْ كُنتُمْ فِى

بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقَتْلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمْ ۖ وَلِيَبْتَلِيَ ٱللَّهُ مَا فِي صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِي قُلُوبِكُمْ ۗ ﴾ آل عمران: ١٥٤ واتە " پێیان بڵێ: ئەگەر لەماڵی خۆشتاندا بوونایە، ئەوانەی کە بڕیارە بکوژرانایە، دەبوا هەروایان بەسەر بهاتایە و لە شوێنی کوژرانیاندا راکشانایە بێگومان خوا ئەم شتانەتان بەسەر دەهێنێت تا ئەوەی لە دەروونتاندا هەیە تاقی بکاتەوە و چی لەدڵەکانتاندا هەیە خاوێنی بکاتەوە و حەقیقەتی دەربخات"، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيَعْلَمَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٦٦﴾ ﴾ آل عمران: ١٦٦ واتە "ئەوەش کە تووشتان بوو لە رۆژی بەیەك گەیشتنی هەردوو ئۆردووەکە (لە جەنگی ئوحود) دا ئەوە بە فرمان و ویستی خوا بوو، تا ئیمانی باوەڕداران دەربخات".

کاتێك خوای گەورە باس لە حەزی مرۆڤ دەکات بۆ سەرکەوتن بەسەر دوژمن، سەرنجی بۆ سەرچاوەی سەرەکی سەرکەوتنەکە رادەکێشێت..

توخوا بیربکەرەوە چۆن قورئان پەیوەستبوونی بەردەوام بە خوای گەورە دەرژێنێتە دەروونەکان ﴿ إِن يَنصُرْكُمُ ٱللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمْ ۖ وَإِن يَخْذُلْكُمْ فَمَن ذَا ٱلَّذِي يَنصُرُكُم مِّنۢ بَعْدِهِۦ ۗ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٦٠﴾ ﴾ آل عمران: ١٦٠ واتە "ئەگەر خوا سەرکەوتنتان پێ ببەخشێت ئەوە هیچ کەس ناتوانێت سەرکەوێت بەسەرتاندا، خۆ ئەگەر پشتتان بەربدات، ئەوە کێ هەیە دوای ئەو کۆمەکتان بکات و سەرتان بخات، دە با ئەوانەی ئیماندارن هەر پشت بەخوا ببەستن". هەروەها دەفەرموێت ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ ﴿٧﴾ ﴾ محمد: ٧واتە "ئەگەر ئێوە پشتیوانی لە ئاینی خوا بکەن و هەوڵی سەرکەوتنی بدەن، ئەوە خوایش پشتیوانی لە ئێوە دەکات و سەرتان دەخات و پایەدارو جێگیرتان دەکات".

سەیر دەکەم کە چۆن خوای گەورە وێنای حاڵەتەکانی دانیشت و هەڵسان و پاڵدانەوە دەکێشێت، کە چۆن نەفس لە هەموو ئەو حاڵاتە بەستراوەتەوە بە یادی خوای گەورە ﴿ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ

جُنُوبِهِمْ ﴾ آل عمران: ١٩١ .واتە" ئەوانەی یادی خوا دەکەن لەکاتێکدا کە بەپێوەن یان دانیشتوون یان ڕاکشاوون (لە هیچ حاڵەتێکدا یادی ئەوزاتە فەرامۆش ناکەن)".

یادی خوا دەکات بە وەستاوی..

یادخی خوای دەکات بە دانیشتووی..

یادی خوا دەکات بە پاڵکەوتوویی..

ئەمە چە وابەستەبوونێکە.. چ دەروونێك لەو وێنە پڕشگندارە زیاتر ئاوەدانکراوەتەوە بە پەروەردگاری؟ لێت دەپرسم تو خوا.. کاتێك ئەو ئایەتە دەخوێنیت، ئەو بەندە ملکەچ و دڵئاوەدانانەت لە بەساڵاچووان نایێتە یادت، ئەوانەی زمانیان لە تەسبحیات و سوپاسگوزاری و یادی خوا ناوەستێت؟

ئایا پێت وایە خوای گەورە هەروا ئەم وێنەیەمان بۆ باس دەکات؟ یاخود خوای گەورە دەیەوێت ئێمەش وابین.. دەروونێك پڕ بە خۆشەویستی خوا، کە هەرگیز لە یادکردنی گەورەیی ئەو زاتە بۆ ساتێکیش بێ ئاگا نابێت..

تەنانەت لە هەست و سۆزی هاوسەرەکان، گەر پەیوەندییەکانی نێوانیان بە حاڵەتی نائاسایی تێپەڕ دەبوو، ئەوا قورئان هانی دڵەکان دەدات کە (غەیب) و ڕەهەندە باوەڕییەکان بهێننە بەرچاوی خۆیان لە پێناو ڕاگرتنی ئەو پەیوەندییە، وەك دەفەرموێت ﴿ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا ﴿١٩﴾ ﴾ النساء: ١٩ واتە "خۆ ئەگەر هاوسەرەکانتان خۆش نەویستن و لێیان بێزار بوون، ئەوە دوور نیە و دەشێت حەزتان لە شتێك نەبێت و خوا بیکات بەمایەی خێر و بێری زۆر و بێسنوور".

گەر ئەو کێشەی نێوان هاوسەرەکان گەیشتە ئاستی جیابوونەوە، خوای گەورە (حوکمکردن)ی لە نێوانیان داناوە، تەنانەت لە پرسی ئەو حوکمکردنەدا قورئان سەرنجی ئەوانەی هەڵساون بەو کردارە ڕادەکێشێت بەوەی کە ڕێچکەکانی ئەو حوکمکردنەش بەستراوەتەوە بە ڕادەی پەیوەستبوونی دڵەکان بە خوای گەورە ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَٱبْعَثُوا۟ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ إِن يُرِيدَآ إِصْلَـٰحًا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيْنَهُمَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا ﴿٣٥﴾ ﴾ النساء: ٣٥ واتە "خۆ ئەگەر ترسان لەوەی نێوان ژن و مێرد بشێوێت

(کێشەیان چارەسەر نەکرێت)، دادوەرێك لە خزمی پیاوەکە و دادوەرێك لە خزمی ژنەکە بنێرن (بۆ ڕێکخستنیان) ئەگەر چاکسازی و ڕێکخستنیان بوێت، ئەوە خوا پێکهاتن فەراهەم دەهێنێت لە نێوان ژن و مێردەکەدا، بێگومان خوا هەمیشەو بەردەوام زاناو ئاگایە".

کاتێك خوای گەورە باسی ولاتێك دەکات، باوەڕدار ناتوانێت بە ئاشکرایی بەندایەتیکردن تیایدا بکات، فەرمانی بە کۆچکردن بۆ ولاتێکی تر پێ دەکات، ئەو کارەشی تەنیا نەکردۆتە گواستنەوەی لە شوێنێکی جوگرافی بۆ شوێنێکی تر، بەڵکو کردوویەتیە "کۆچکردن لە پێناو زاتی خوادا"، وەك دەفەرموێت ﴿ وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً ۚ وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۗ ﴾ النساء: ١٠٠ واتە "هەر کەسێکیش ماڵ وحاڵی خۆی بەجێ بهێڵێت ولە پێناو خواو پێغەمبەرەکەیدا دەرچێت (واتە بەرەو ولاتی ئیسلام، یاخود شوێنێکی ئازاد) کۆچ بکات، پاشان مردن یەخەی پێبگرێت، ئەوە ئیتر ئەو کەسە پاداشتەکەی کەوتۆتە سەر خوا (هەر خۆی دەزانێت چۆن پاداشتی دەداتەوە". گەر سەیری وێنەکە بکەی تەنیا وا دەردەکەوێت کۆچکردنە لە ولاتێك بۆ ولاتێکی تر، بەلام لە تەرازووی قورئانیدا "کۆچکردنە بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی".

لە سەیرترین بابەتەکانی قورئان لە بەستنەوەی دروون و دڵەکان بە خوای گەورە و ئاوەدانکردنەوەی پێی، کە پێم وابێ هیچ بەڵگەیەك لەمە روونتر نییە: ئەویش (نوێژی ترسە لە حاڵی شەڕدا)، ئەم عیبادەتکردنە چەندەها پەندی بۆ کەسانی خاوەنهۆش تێدایە..

خودی قورئان سیفەتەکانی ئەم نوێژەی شیکردۆتەوە، لە سوننەتی پێغەمبەریشدا بە حەوت جۆری دیار هاتووە، کە وردەکارییەکەی لە کتێبە فیقهیەکاندا هەیە.. توخوا بێنە بەرچاوی خۆت، موسڵمان بەرگی شەڕی لەبەر کردووە، لەسەر هێڵی رووبەروو بوونەوەیە، دوژمن خۆی مەلاس داوە، دەروونەکان شڵەژاون، ناڵەناڵ ئاسمانی بڕیووە، خوێن لە ژێرپێیەکان رژاوە.. لەگەڵ هەموو ئەمانەدا خوای گەورە نافەرموێت واز لە نوێژ بێنن تا شەڕ کۆتایی دێت، بەڵکو بۆیان شی دەکاتەوە کە چۆن "نوێژێکی بە کۆمەڵ" لەو حاڵەتە ناخۆشەدا بکەن ﴿ وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓا۟

أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُواْ فَلْيَكُونُواْ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّواْ فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ حِذْرَهُمْ ﴾ النساء: ١٠٢ واتە "کاتێکیش تۆ (ئەی پێغەمبەر ﷺ) لەناو هاوەڵاندا بویت و پێش نوێژیت بۆ دەکردن (لە کاتی جەنگدا)، ئەوە با دەستەیەکیان لەگەڵ تۆدا بوەستن بۆ نوێژ و چەکەکانیان پێ بێت، جا کاتێك ئەم دەستەیەی کە نوێژ دەکات چوونە سووژدە بائەوانی تر لە پشتانەوە بن (ئینجا کە لێبوونەوە لەو رکاتە) ئەو دەستەیەی تر کە پاسەوانییان دەکرد و نوێژیان نەکردووە بابێن لەگەڵ تۆدا نوێژەکەیان بکەن، با هوشیار و چەکداریش بن".

ئایا دەزانی هەر چی لە دونیا هەیە هەمووی شاهێدە لەسەر خۆشەویستی و بەگەورەزانینی خوای گەورە، لە پێناو وابەستەبوون بەو زاتە و بەردەوامبوونی رازونیاز گۆڕینەوە لەگەڵی.

ئایا هیچ پیاوێك هەیە کەمێك لە ترسی خوای هەبێت، لە کاتی ئارامی و هێمنیدا و حەسانەوەدا نوێژی بە کۆمەڵ پشتگوێ بخات، لە کاتێکدا خوای گەورە داوای نوێژی بە کۆمەڵ لە جەنگەوەران دەکات و چۆنییەتی ئەنجامدانی نوێژەکەشیان بۆ روون دەکاتەوە، لەو ساتەی ئەوان لە ژێر ئەگەری بۆردومان و هێرشی دوژمنن؟؟

ئایا دڵەکان لەسەر جێگای خەویان هەڵدەستن و بەرماڵەکەیان لە ژووری خۆیان رادەخەن بۆ ئەوەی نوێژێکی "تاکی" بکەن، بیربکەرەوە چۆن خوای گەورە داوای نوێژی "کۆمەڵ" لەنێوان شمشێر و تیر و خەندەقەکان دەکات...؟!

ئایا پێت وایە خوای گەورە لە ژێرمەترسی شەڕدا فەرمانی نوێژی بە کۆمەڵ بە جەنگاوەر دەکات و چۆنییەتی ئەنجامدانەکەشی لە کتێبەکەی بۆ روون دەکاتەوە، لە کاتێکدا گلەیی لەو کەسانە ناکات کە لەژێر پێخەفیان پاڵیان داوەتەوە یان لەسەر مێزی کارکردنیان دانیشتوون؟ ئایا دەشێ شەریعەتی خوای گەورەی هاوتای عەقڵ، بڕیار لەو شتە بدات؟!

هەر بۆ خۆشی، ئەو ئایەتەی دوای ئایەتەکەی پێشوو دێت باس لە تەواوکردنی نوێژەکە دەکات، باشە.. ئێمە ئێستا لە سیفەتەکانی نوێژ لە ساتی بەریەککەوتنی دوولایەنی شەڕکەر گەیشتین، ئایا ئەو ڕێنماییە

چییە قورئان دوای تەواوبوون لەو نوێژە دەیخاتە ڕوو؟ پەروەردگار دەفەرموێت ﴿ فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ ۚ فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ ﴾ النساء: ١٠٣.واتە "جا كاتێك لە نوێژ بوونەوە ئەوە یادی خوا بکەن بەپێوەبن یان بەدانیشتنەوە یان بە ڕاکشانەوە (بەهەرجۆرێك بۆتان گونجا)".

پاك و بێگەری بۆ خوا.. ئەوە جەنگاوەرەی لە نوێژی بە کۆمەڵ تەواوبوو، ڕاستەوخۆ قورئان ڕێنمایی دەداتیٚ کە بەردەوامیێت لە یادکردنی خوا..

ئایا کارەکە لێرەدا تەواو دەبێت؟

نەخێر، هێشتا تەواو نەبووە، ئایەتەکە بەردەوام دەبێت تا باس لە کۆتاییهاتنی حاڵەتی ترسی دەکات، کە لە دوایی حاڵەتی ئارامی دەست پیٚ دەکات، وتەکانی ئایەتەکە بەردەوام دەبن جارێکی دیکە بۆ بەستنەوەی دڵ و دەروونەکان بە خوای گەورە ﴿ فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ واتە "کاتێکیش ئارامی باڵی کێشا بەسەرتاندا و نیشتەجیٚ بوون، ئەوە نوێژ بەچاکی و تەواوی ئەنجام بدەن".

هەموو بابەتەکە بۆ خوای گەورە بوو...

توخوا جارێکی دیکە هەردوو ئایەتەکە لەسەر یەك بخوێنەوە ﴿ وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓاْ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُواْ فَلْيَكُونُواْ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّواْ فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ ۗ وَدَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓاْ أَسْلِحَتَكُمْ ۖ وَخُذُواْ حِذْرَكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٠٢﴾ فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ ۚ فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَـٰبًا مَّوْقُوتًا ﴿١٠٣﴾ ﴾ النساء: ١٠٢ - ١٠٣

کاتێك خوای گەورە لە سوڕتی (طە) باس لە نوێژ دەکات، ئاماژە بە ئامانجێك دەکات لای زۆرێك لە نوێژخوێنان ونە، لەوانەیە یەکێك لە ئێمە باس لە گەورەیی نوێژ لە ئیسلام بکات، گەورەترین روکنە لە دوای (هەردوو شەهادەتەکە)، تەنانەت هێڵی جیاکەرەوەیە لە نێوان کوفر و ئیماندا، بەڵام بۆچی خوای گەورە نوێژی داهێناوە و خۆشەویستی کردەوە لای خۆی؟ چونکە دەروازەی ئامادەیی خوایی و یادکردنیەتی، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ﴾ طه: ١٤ واتە "نوێژەکانیشت بەچاکی ئەنجام بدە، تا هەمیشە منت لە یاد بێت". بەمشێوەیە زۆر بە روونی.. موسڵمانان نوێژ ئەنجام دەدەن لە پێناو یادکردنی خوا بە هەمیشەیی..

بەڵکو کاتێك خوای گەورە باس لە ئاژەڵە راوچییە راهێنراوەکان دەکات، باسکردنی راهێنانیان هەروا باس نەکردووە.. بەڵکو بە راستییەکی عەقیدەیی باوەڕیی بەستۆتەوە، بۆ ئەوەی دڵ بەردەوام بەسترابێتەوە بە گەورەیی خوا.. بیر بکەرەوە چۆن موسڵمان لەسەر ئەمە ئاگادار دەکاتەوە ﴿ وَمَا عَلَّمۡتُم مِّنَ ٱلۡجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ ٱللَّهُۖ ﴾ المائدة: ٤ واتە "ئەوەش باڵندە و تانجی شکاری بۆتان راو دەکەن و فێرتان کردوون (بێگومان خوا توانای بەخشیووە بە مرۆڤ بتوانێت مەشق بکات بەگیانداران و فێریان بکات راوی بۆ بکەن بەتایبەتی تانجی".

تەنانەت فێکردنی باڵندەی شکار و سەگی راو، پێویستە باوەڕدار ئەوە بزانێت ئەو فێکردنە لە فێرکردنی خوای گەورەیەوە..

بوونی پەیوەندی خوایی چەند زۆرە لە قورئان..

جارێکی تر قورئان بیرەوەرییەکی هاوەڵە بەرێزەکان زیندوو دەکاتەوە، کە خەریك بوو کافرەکان هێرشیان بکەنە سەریان و بیانکوژن، قورئان ئەو رووداوە مێژووییە دەردەخات بۆ بەرزرکردنەوەی دڵەکان زیاتر بۆلای خوای گەورە، ئەوانەی لەو رووداوە رزگاری کردن، وەك دەفەرموێت ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ هَمَّ قَوۡمٌ أَن يَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ فَكَفَّ أَيۡدِيَهُمۡ عَنكُمۡۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾ المائدة: ١١ واتە "ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە یادی ناز و

نیعمەتی خوا بکەنەوە لەسەرتان کاتێك هەندێك ویستیان دەست درێژی بکەنە سەرتان، خوایش دەست درێژیەکەی راگرتن (ئێوەی پاراست)، دەی کەواتە لە خوا بترسن و پارێزگار بن، دەبا ئیمانداران هەر پشت بەخوا ببەستن".

پیاوانی تەفسیر چەند ڕووداوێکیان بەستۆتەوە بەو ئایەتە، لەوانە، وەك لە بوخاریدا هاتووە هەوڵی ئەعرابییەك بە ناوی (غورث بن الحارث) کە ویستی پێغەمبەری خوا ﷺ بکوژێت.. هەروەها نمونەی پیلانگێڕی یەهودییەکان بۆ کوشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵەکانی، خوای گەورەی وەحی بۆ نارد و پیلانەکەیان ئاشکرابوو.. لەگەڵ چەند ڕووداوێکی تر..

گرنگ لێرەدا دیاریکردنی جۆری ڕووداوەکان نییە، کە پیلانی بێ باوەڕان دژی پێغەمبەر و هاوەڵانی شکست پێهات.. بەڵکو گرنگتر لەوە ئەوەیە، کاتێك کەسی سەرنجدەر لە قورئان دەبینێت چۆن قورئان هاوەڵان بە یادکردنەوەی ئەو چیرۆکە ئاگادار دەکاتەوە لە پێناو زیندووکردنەوەی پەیوەندی دڵەکانیان بە خوای گەورە. هۆشیاریان دەکاتەوە لەوەی خوای گەورە دەستدرێژی بێ باوەڕانی لەسەریان راگرت، بۆیە پێویستە دڵەکان پشت بە خوا ببەستن..

کۆمەڵە ئایاتێك کە لە مێشکی هاوەڵان یادەوەری ڕووداێك دێنێتە دەرەوە کە بە سەلامەتی لێی دەرچوون، ئەمە باس ناکات تەنیا بۆ بەرزکردنەوەی دڵەکان بۆلای بەدیهێنەری پاکوبێگەرد نەبێت.. وەك ئەوەی ئەو ئایەتانە بڵێن: ئاگاداربن سەلامەتبوونتان لەو ڕووداوانە کارێکی هەروا ئاسایی نەبووە، بەڵکو فەزڵ و گەورەیی و رەحمی خوای گەورەیە، بۆیە یادی بکەن و لەبیری نکەن، با دڵەکان بژێینەوە و زمانەکان بەردەوامبن بە سوپاسکردنی ئەو خوایە.. سەیرکە ئەرکی باسکردنی (مێژوو و ڕووداوی شەڕەکان) لە قورئاندا چییە؟ ئینجا بەراوردی بکە بە شێوازی مامەڵەکردنی ئێمە لەگەڵیدا..

بیرهێنانەوەی قورئان بە هاوەڵان بەو شەڕانە، هاوشێوەی فەرمایشتی خوای گەورەیە لە سورەتی (ابراهیم) لە بارەی موساوە ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَذَكِّرْهُم بِأَيَّامِ اللَّهِ ۚ ﴾ إبراهيم: ٥ واتە "سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە موسامان ڕەوانە کرد،

هاوڕێ لەگەڵ موعجیزەی زۆردا (فەرمانمان پێدا) کە قەوم و عەشرەتت لە تاریکیەکان رزگار بکە و بەرەو نوور و رووناکی بیانبە، رۆژەکانی خوایان بهێنەرەوە یاد (ئەو رۆژانەی کە تۆڵەی لە بێ باوەڕان سەند و ئیماندارانی سەرخست".

موسا لە وەڵامدانەوەی ئایەتی دوای ئەو دەفەرموێت ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ أَنجَىٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ ﴾ إبراهيم: ٦ واتە "کاتێك موسا بە قەومەکەی وت: یادی ناز و نیعمەتەکانی خوا بکەنەوە لەسەرتان، کاتێك لە دارو دەستەی فیرعەون رزگاری کرن".

کاتێك خوای گەورە چیرۆکی موسا (سلاوی خوای لەسەر بێت) باس دەکات، کە فەرمانی بە قەومەکەی دا بچنە زەوی پیرۆز (الارض المقدسة)، کە بە گوێرەی رای تەفسیرزانەکان ناوچەی (طور) و دەوروبەریەتی، قەومی موسا تەمبەڵیان کرد و بیانویان هێناوە، بەوەی لەو شوێنە خەڵکانێکی ئازا و دلێر و بەجەرگی لێیە و توانایان زۆرە و ناتوانین بەرەنگاریان بوەستینەوە. لەوساتەدا دوو پیاو لە قەومی موسا هەڵوێستێکی ئازایانەیان نواند و وەڵامی داواکاری موسایان دایەوە، خەڵکەکەیان هۆشیار کردەوە کە بەس ئەوەی بچنەسەر دوژمنەکان، بە یارمەتی خوای گەورە لەناودەچن.. خوای گەورە باسی ئەو دوو پیاوە پاڵەوانانە ناکات بەوەی خاوەنی چاکە و پیاوەتین، بەڵکو روونی دەکاتەوە کە هەڵوێستە پاڵەوانەکانیان پاشخانی تری هەیە.. توخوا سەیری شێوازی قورئان بکە لە نمایشکردنی ئەو دیمەنە، خوای گەورە قسە لەگەڵ موسا دەکات ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٠﴾ يَٰقَوْمِ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْأَرْضَ ٱلْمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِى كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَارِكُمْ فَتَنقَلِبُوا۟ خَٰسِرِينَ ﴿٢١﴾ قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا حَتَّىٰ يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ ﴿٢٢﴾ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمَا ٱدْخُلُوا۟ عَلَيْهِمُ ٱلْبَابَ فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ فَإِنَّكُمْ غَٰلِبُونَ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾ المائدة: ٢٠ - ٢٣ واتە "یادیان بێنەوە کاتێك موسا بە قەومەکەی گوت: ئەی قەوم و عەشرەتم یادی

ناز و نیعمەتی خوا بکەنەوە لە سەرتان کە پێغەمبەرانی لەناو ئێوەدا فەرام هێناوە، هەروەها پاشای زۆری لە ناوتاندا هەڵخستووە، ئەوەی بە ئێوەی بەخشیوە بە کەسی تری نەبەخشیووە لەو خەڵکە بێ شومارییە (ئەو سەردەمە) (٢٠) ئەی قەوم و عەشرەتم بچنە ناو ئەو زەویە پیرۆزەیە، کە خوا پێویستی کرد لەبەر سوودی خۆتان بچنە ناوی، پاشگەز مەبنەوەو پاشەکشێ مەکەن تا خەسارەتمەندو زەرەرمەند نەبن (٢١) (کەچی) وتیان: ئەی موسا بەڕاستی خەڵکێکی ئازا و بەرز و دلێری تێدایە، بێگومان ئێمە هەرگیز ناچینە ناوی تا ئەوانی لێدەرنەچن، جا ئەگەر ئەوان دەرچوون لێی، ئەوە بێگومان ئێمە دەچینە ناوی و لەوێ دەبین (٢٢) !!(بەڵام) دوو کەس لەوانەی کە ترسی خوایان لەدڵدا بوو و خوا نا زو نیعمەتی ئیمان و دڵنیایی تەواوی پێ بەخشیبوون وتیان: لە دەروازەی شارەوە بچنە سەریان و (یەك هێرشی گەورە بەرن) هەر کە چوونە ئەو دیوەوە، ئەوە بێگومان ئیتر ئێوە سەرکەوتوون (دوژمنتان شکست دەهێنێت، جا بۆ بەدەستهێنانی ئەو سەرکەوتنە) دەبێت: بە تەواویی پشت بە خوا ببەستن ئەگەر ئێوە ئیماندارن".

لەوانەیە سەرنجی ئەو بابەتەت دابێت، کە چۆن قورئان پێداگیری دەکات لەسەر دەرخستنی پاشخانی پەیوەندی بەستن بە خوای گەورە، ئەو دوو پیاوە بۆیە ئەو هەڵوێستە راستەیان نواند، چونکە لە خوا دەترسان، بۆیە خوای گەورە نیعمەتی پلەوپایەی باوەڕ و ئاینی پێ بەخشین.. تەنانەت دیقەت بدەنە راسپاردەکەیان بۆ قەومەکەیان کە گوتیان ﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ ﴾ پشت بە خوا بەستن لە دیارترین پلەوپایەکانی پەیوەستبوونی دڵە بە خوای گەورە، بەڵکو پشت بەستن بریتییە لە ساتی وابەستبوونی کرداری بە پەروەردگار.

ناوەرۆکی سەرەکی ئەو رووداو و گفتوگۆیەی نێوان موسا و قەومەکەی بریتییە لە ناوەندبوونی پەیوەستبوون بە خوای گەورە.. موسا خوای گەورەیان بە بیردێنێتەوە بۆ ئەوەی بچنە ناو زەوییە پیرۆزەکە، دوو پاڵەوانی دیمەنەکە، هەڵوێستەکەیان لە نیعمەتی باوەڕییەوە سەرچاوەی گرتبوو کە خوای گەورە پێی بەخشیبوون، دواترین ئامۆژگاریان بریتییە لە (پشت بەستنە بە خوای گەورە)..

پاشان قورئان باس لە دیاردەی کارەسات و بەڵاو و زەرە و زیانەکان دەکات کە لە ژیانیدا توشی مرۆڤ دەبن، سەرباری ئەوەی خوای گەورە رێگەی پێداوین دەست بە هۆکارەکان بگرین، وەك دەرمان بۆ چارەسەری

نەخۆشی، دوای رزقکردن بۆ رزگاربوون لە هەژاری، بەڵام قورئان رۆشانییەکە لەسەر بابەتێکی تر چڕ دەکاتەوە، ئەویش وابەستەبوونی دڵەکانە لە ساتی رووبەڕووبوونەوەی ئەو کارەسات و بەڵایانە بە خوای گەورە.. سەیرکە چۆن قورئان ئەو مەبەستە دادەڕێژێت.. دەفەرمویێت ﴿ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٧﴾ ﴾ الأنعام: ١٧واتە "(دڵنیابە لەوەی) ئەگەر خوا دووچاری زیان و گرفتێکت بکات، ئەوە هەرگیز لابەری نیە جگە خۆی نەبێت، خۆ ئەگەر بیەوێت تووشی خێرو خۆشیەکت بکات، ئەوە ئەو خوایە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە".

لە شوێنێکی تری هاوشێوەی ئەو دیمەنە دەفەرمویێت ﴿ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ ۚ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٧﴾ ﴾ يونس: ١٠٧ واتە "(ئەی مرۆڤ) ئەگەر خوا تووشی ناخۆشی و زیانێکت بکات، ئەوە هیچ کەس ناتوانێت فریات بکەوێت و لەسەرتی لابەرێت جگە لەو زاتە، یاخود ئەگەر بیەوێت تووشی خێر و خۆشیەکت بکات، ئەوە هیچ کەس ناتوانێت بەری فەزڵ و بەخششی خوا بگرێت، هەرکام کە بیەوێت لە بەندەکانی بەهرەوەر دەکات (لە نازو نیعمەتانی بێشومار) ئەو زاتە هەمیشە لێخۆشبوو میهرەبانە".

لەوانەیە سەرنجت لەسەر واتەیەکی تر دابێت، ئەوەیە کە ئەو دوو ئایەتە تەنیا باس لەوە دەکەن کە لابەری زیان و ناخۆشییەکان خوای گەورەیە، بەڵکو لەوە سەیرتر ئەوەیە کە ئایەتەکان ئاماژە بەوە دەکەن ئەو کەسەی دووچاری گرفت و ناخۆشیت دەکات تەنیا خوای پاك و بێگەردە!

گەر باوەڕدار لە نهێنییەکانی ئەو ئایەتانە قوڵ ببێتەوە، دڵی پڕ دەبێت لە دڵنیایی، لەوەی ئەو کەسەی توشی هەژاری و نەخۆشی دەکات خوای گەورەیە، ئەو کەسەی ئەو زیانەش لا دەبات هەر ئەو زاتەیە، ئینجا چارەسەری دەکات، بۆیە دەستپێکەری کارەکە و کۆتاییهێنەری لە خواوە بۆ خوایە، ئینجا دڵ جگە لە خوا چیتری تێدا دەمێنێتەوە؟

خوای گەورەیە– جل جلاله -کە دەیخاتە ناخۆشییەکان، هەر خوای گەورەیە– جل جلاله -لەسەری لا دەبات، بەم شێوەیە باوەڕدار لە ڕاستییەکانی زانستی خوای گەورە و باوەڕ و ئاوەدانکردنەوەی دەروونەکان بە شکۆیی ئەو قوڵ دەبێتەوە..

پاشان قورئان لە بازنەی (تاك) و خەمە کەسییەکانی دەچێتە بازنەیەکی فراوانتر کە بازنەی (کۆمەڵگا) و پرس و کاروبارە گشتییەکانە، دەبێت خوای گەورە لە مەزندەکردنی قەیرانەکانی کۆمەڵگا چی بوێت؟ بێگومان حیکمەتێکی خوایی لە کارەساتەکانی کۆمەڵگا هەیە، دەبێ چی بێت؟ جگە لە ڕاستییە گەورەکەی قورئان نەبێت هیچی تر نییە، ئەو ڕاستییەی کە بینیمان لە شادەماری شاهێد و نمونەکانی پێشوو هاتوچۆ دەکات، زۆر بە ڕوونی خوای گەورە پەردە لەسەر حیکمەتی بوونی قەیران و کارەساتەکانی کۆمەڵگا لا دەبات و دەفەرموێت ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَتَضَرَّعُونَ ﴿٤٢﴾ فَلَوْلَآ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُوا۟ وَلَٰكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ الأنعام: ٤٣ الأنعام: ٤١ - ٤٢ واتە "سوێند بێت بێگومان ئێمە پێش تۆ پێغەمبەرانی زۆرمان ڕەوانە کردووە بۆ سەر قەوم وگەلانی تر(جا کاتێك سەرکەش و یاخی بوون)، تووشی تاڵاوی جەنگ و بەڵاو تەنگانەمان کردن بۆ ئەوەی لێمان بپاڕێنەوەو بلاڵێنەوە (٤١) ئەوانە کاتێك تۆڵە و سزای ئێمەیان بۆ هات، بۆ نزاو پارانەوەی بەکوڵیان نەکرد، بەڵام دڵیان ڕەق و ڕەش بوو، شەیتانیش ئەو کاروکردەوە ناپەسەندانەی بۆ ڕازاندبوونەوە کە دەیانکرد".

لە ئایەتێکی تردا پلەیەکی ئیمانی جوانتر هاوشێوەی پاڕانەوە و لاڵانەوە (التضرع) پیشان دەدات، ئەویش خۆبەدەستەوەدان و ملکەچ بوونە (الإستكانه) بۆ خوای گەورە، وەك دەفەرموێت ﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَٰهُم بِٱلْعَذَابِ فَمَا ٱسْتَكَانُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ ﴿٧٦﴾ ﴾ المؤمنون: ٧٦ واتە "سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە تووشی سزا و ئازاری (جۆرا و جۆرمان) کردن، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا نە ملکەچ بوون بۆ پەروەردگاریان و نە لێیی دەپاڕێنەوە".

ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر تاك و کۆمەڵدا دێت، بە شێوەیەکی گشتی خوای گەورەی ویستی ئەوەیە بگەڕێینەوە لای ئەو، وەك دەفەرموێت ﴿ وَبَلَوْنَٰهُم بِٱلْحَسَنَٰتِ وَٱلسَّيِّـَٔاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾ الأعراف: ١٦٨ واتە "بەچەندەها خۆشی و ناخۆشی تاقیمان کردنەوە بۆ ئەوەی ئەوان بگەڕێنەوە".

ئەمەیە وانە سەرەکییەکە لە دیاردەی گرفت و بەلا خەمهێنەرەکانی تاك و کۆمەڵگا.. لە نمونەی هەژاری و نەخۆشی و قەیرانە ئابورییەکان و کارەساتە سروشتییەکان، خوای گەورە دەیەوێت ئەوانە ببنە پردێك بۆ لای ئەو، دەیەوێت بە هۆیەوە دڵەکانمان بە ئارامی و ئاسوودەیی خوای گەورە بە ئاگابێتەوە، لێی بپاڕێنەوە، پێیەوە پەیوەست بین.. ئەمە بەراورد بکە بە شێوازی مامەڵەکردنمان لەگەڵ ئەو دیاردانە، ئینجا دووری ئێمەت لە راستییە گەورەکەی قورئان بۆ دەردەکەوێت..

یەکێك لە شێوازە دەربڕینە گشتگیرییەکان کە قورئان بۆ پەروەردەکردنی ئەو راستییە گەورەیە لە دەروونمان بەکاری دەهێنێت، فەرمایشتی پەروەردگارە لە کۆتاییەکانی سورەتی (الانعام): ﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ الأنعام: ١٦٢ واتە "ئەی پێغەمبەر ﷺ (ئەی ئیماندار) بڵێ: بەڕاستی نوێژ و حەج و دروشمەکانی و(سەرجەم چاکە و بەندایەتیم) هەروەها ژیان و مردنم تایبەتە بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانەوە".

ئینجا سەیر بکە چۆن ئەو ئایەتە بنەماکانی بەندایەتیکردن، ژیان و مردنی لەخۆ دەگرێت، هەمووشی تایبەت کردووە بە خوای گەورە.. زۆرێك لە خەڵکی ئەمڕۆ دەزانن چۆن نوێژ بکەن بۆ خوا، چۆن حەج بکەن خوا.. بەڵام کەم خەڵك هەیە بزانێت چۆن بژیت بۆ خوا، هەروەها چۆن بمرێت بۆ خوا؟ !بۆیە ئەم ئایەتە پیرۆزە دەروونەکان بەو پلە ئیمانییە پیرۆزە پاك دەکاتەوە ئەمەش بریتییە لە کرۆکی قورئان..

سەرەتای سورەتی (الانفال) باسی هەڵەنگوتنەکانی جەنگی بەدرمان بۆ دەکات، پاشان کارلێکەکان و پێشهاتەکانی لە نێوان دەستگرتن بەسەر کاروانی قورەیش و رووبەڕووبونەوە سەربازی، تا ناوەرۆکەکە دەگاتە ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی موسڵمانان لە شەڕدا بەسەر بێ باوەڕوەکان بە دەستیان هێنا.. ئایا دەزانی سەیرەکە لە هەمووی لە چی دایە؟ قورئان دوای شیکردنەوەی ئەو رووداوە یەك لە دوای یەکانە،

پرسێکی گرنگ لە بارەی پەروەردەکردنی پەیوەستبوون بە خوا و گەڕاندنەوەی فەزڵ و گەورەیی بۆ ئەو زاتە لە دوای ئەوە باس دەکات، توخوا بیر لەو دەربڕینە قورئانە لە جەنگی بەدر بکەرەوە ﴿ فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ قَتَلَهُمْ ۚ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ رَمَىٰ ۚ وَلِيُبْلِيَ الْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَاءً حَسَنًا ۚ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ الأنفال: ١٧ واتە "ئەی ئیمانداران: وەنەبێت ئێوە کافرانتان کوشتبێت، بەڵکو خوا کوشتنی و لەناوی بردوون، (تۆش ئەی محەمەدﷺ) کاتێك مشتێك خۆڵت روو بەکافران فڕێدا ئەو کارە تەنها تۆ نەتکرد، بەڵکو خوا فڕێیدا و (خۆڵی کردە چاوی کافرانەوە)".

ئەی خوایەگیان لەو سەیرە.. هاوەڵە موجاهیدکارەکان ئەوانبوون کوشتنیان، پێغەمبەر ﷺ ئەوبوو خۆڵی فڕێدا فەرمووی "دەموچاویان شێوا" لەگەڵ ئەوەشدا قورئان دەفەرموێت: نەخێر، نە ئێوە بوون کە کوشتنتان، نە پێغەمبەری خوا ﷺ تۆش بووی فڕێتدا. واتای ئەوەیە کە خوای گەورە بوو وایکرد بەسەریاندا زاڵ بن، بەڵام لەبەر بەهێزی بەسترانەوەی فەزڵ و چاکەکە بە خوای گەورە، کارەکەی بە زاتی ئەو بەستۆتەوە ! سەیرکە چۆن دڵەکان بۆ ئاسمان ئاڕاستە دەکرێن و لە پەتی بەسترانەوەی بە زەوی رزگاری دەبێت.

گەر بە وردی و سەرنجەوە بیر لەو ئایەتە بکەیەوە ﴿ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ ﴾، دەبینی چەسپاندن و رەتکردنەوەیەکی تێدایە، کرداری فڕێدانی بۆ پێغەمبەر چەسپاندووە، بەڵام فڕێدانێکی تری لەو رەتکردۆتەوە، چەسپاندن فڕێدانەکە بووە، رەتکردنەوەش گەیاندن و پێراگەیاندن بووە، وەك پێشەوا ئیبن تەیمیە (رەحمەتی خوای لێ بێت) باس لە چەند روویەکی ئەو ئایەتەی کردووە و گفتوگۆی لەبارەوە کردووە، هەر کەسێك دەیەوێ زیاتر رۆبچێتە ناو ئەو بابەتە با بگەڕێتەوە فتوای ژمارە(١٥/٣٩) .

ئەم واتایەی باسکرا لە سورەتی (الانفال) بە ئایەتێکی تری سورەتی (التوبە) دەچێت کاتێك پەروەردگار دەفەرموێت ﴿ قَاتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ ﴾ التوبة: ١٤ واتە "ئەی (ئیمانداران) بجەنگن دژی بێ باوەڕان، ئەوە خوایە کە بەدەستی ئێوە سزایان دەدات".

سەیرکە چۆن هۆکارەکەی بە دەستی هاوەڵەکان بەستۆتەوە، شوێنکەوتەکەشی بۆ خوای پەروەردگار! ڕاستە ئێوە لەگەڵیان دەجەنگن، بەڵام ئەوە خوایە بەو هۆیەوە سزایان دەدات!

دیمەنی وابەستەبوونی دڵەکان بە خوای گەورە لە کۆمەڵگەی موسڵمانی ناوەستێت، بەڵکو قورئانخوێن بەرەو پەروەردبوون لەسەر وابەستبوون دەروونی (بەدیل گیراوەکان) ئاراستە دەکات.. ئەوانە بەدیل گیراون لە کۆمەڵی بێ باوەڕانی جەنگاوەر ئەوانەی نەیانتوانی ئامانجە گڵاوەکەیان بهێنە دی! لەگەڵ ئەوەشدا کتێبەکەی پەروەردگار هانمان دەدات ئەوان لەسەر واتاکانی (کرداری دڵەکان) تێبگەێنین، خوای پەروەردگار لە سوڕەتی (الانفال) دەفەرموێت ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ إِن يَعۡلَمِ ٱللَّهُ فِي قُلُوبِكُمۡ خَيۡرٗا يُؤۡتِكُمۡ خَيۡرٗا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ ﴾ الأنفال: ٧٠واتە "(ئەی پێغەمبەر ﷺ) بەو دیلانە بڵێ کە لەبەر دەستاندان، ئەگەر خوا خێر لە دڵەکانتاندا بەدی بکات، ئەوە زۆر لەوە باشترتان پێ دەبەخشێت کە لێتان وەرگیراوە، (ئەگەر باوەڕ بهێنن) لێتان خۆش دەبێت، خوایش لێخۆشبوو میهرەبانە)".

پێویستە دیلەکان بزانن، هەموو بابەتەکە وابەستییە بەوەی لەناو دڵەکانە!

کاتێك خوای گەورە باسی چیرۆکی ئەو سێ کەسە دەکات کە لە جیهاد دواخران، ئەوانیش کەعبی کوڕی مالیك و دوو هاوڕێکەیەتی، ئەم چیرۆکە بە درێژی لە (سەحیحی بوخاریدا) هاتووە، ئایەتەکان باس لە حاڵەتی ئالۆزیان و ئەو خەمەی توشی بوون دەکات، پاشان ئایەتەکە دەگاتە کرۆکی بابەتەکە ئەویش "حاڵەتی ئیمانییە" کە خوای گەورەی خۆشی دەوێت، بوونی ئەو حاڵەتەش لەواندا بەرز دەنرخێنێت، ئایتەکە ئەمە دەکاتە کۆتایی دیمەنەکە، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ وَضَاقَتۡ عَلَيۡهِمۡ أَنفُسُهُمۡ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلۡجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيۡهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡ لِيَتُوبُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ١١٨ ﴾ التوبة: ١١٨ واتە "خوای گەورە تەوبەی ئەو سێ کەسەشی وەرگرت کە (لە غەزای تەبووك) دواخران دوای ئەوەی کە زەوی چەندە فراوانە لێیان تەنگ بۆوە، خۆیشیان لە خۆیان بێزار بوون، دڵنیاش بوون کە هیچ پەنایەك نیە (لەخەشم و قینی خوا بیانپارێزێت) جگە

لەوەی خۆیان بدەنە پەنای ئەو زاتە، پاشان تەوبەی لێ وەرگرتن، تا تەوبە بکەن، بەڕاستی هەرخوا تەوبە وەرگرو میهرەبانە".

دەبینی نمایشی ئەو ئایەتە بۆ ئەو پلە ئیمانییە لە کارتێکردنیان لە غەم و پەژارە چەند جوانە، دوای ئەوەی دەرەوەیان لەبەرچاو تەنگ بوو (زەوی کە چەند فراوانیشە) ناوەوەشیان لەبەرامبەر تەنگ بوو (دەروونیان تەنگ بوو) ئینجا ئایەتەکە دەگاتە لوتکەی باوەڕ ﴿ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلۡجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيۡهِ ﴾ سەیرەکە لەوەدانییە کە ئەوان خۆیان وابەستەی خوا کرد، بەڵکو سەیرەکە لە ئاماژەی ئایەتەکەدایە لە دەستپێکردن و کۆتایی پێهیان، مەبەستم وایە کە رزگاربوون لە دەست خوای گەورە نییە تەنیا بۆلای خوای گەورە نەبێت، هەر خوایە لێرەدا خۆی ترسێنەرە، هەر خواشە خۆی پەناگەیە، ئەمە ئەو دلآنەن کە خوای گەورە خۆشی دەوێن..

ئەوەی روون دەبێتەوە ئەوەیە کە خوای گەورە دەیەوێت دڵی بەندەکەی هەر لە پاڕانەوە و داوای یارمەتیکردن لە کاتی بوونی کێشە و رزگاربوون لێی بمێنێتەوە.. ئەمە ئەدەب نییە لە کاتی بوونی کێشە لێی بپاڕێیتەوە پاشان لەکاتی باشتربوونی حاڵەتەکەشدا لە خوای بێ ئاگا بیت، بۆیە خوای گەورە ئەو دیمەنەمان لە سورەتی (یونس) بۆ وەسف دەکات ﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ٱلضُّرُّ دَعَانَا لِجَنۢبِهِۦٓ أَوۡ قَاعِدًا أَوۡ قَآئِمًا فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُ ضُرَّهُۥ مَرَّ كَأَن لَّمۡ يَدۡعُنَآ إِلَىٰ ضُرّٖ مَّسَّهُۥۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلۡمُسۡرِفِينَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾ یونس: ١٢ واتە "کاتێکیش ئادەمیزاد (ئەوانەیان کە باوەڕ لە دەروونیاندا بەچاکی دانەمەزراوە) زیان و ناخۆشیەکی تووش بێت، ئەوە هاناو هاوار بۆ ئێمە دەهێنێت بۆ لابردنی، لەکاتی راکشاندا، یان بە دانیشتنەوە، یان بە پێوە بێت، جا کاتێك زەرەر و زیانەکەی لێ دوور دەخەینەوە و دەکەوێتەوە باری ئاسایی، هەروا دەڕوات بەرێدا و بارودۆخی ئەوسای فەرامۆش دەکات، هەروەك رۆژێ لە رۆژان هاواری لە ئێمە نەکردبێت و لە ئێمە نەپاڕابێتەوە تا ناخۆشی و زیانێك کە تووشی بووە لێی دوور بخەینەوە، ئا بەو شێوەیە بۆ لە سنوور دەرچووان ئەو کا رو کردەوانەی کە دەیانکرد رازێنراوەتەوە".

سەیرکە چۆن بێزاری کە توشی مرۆڤ دەبێت لە کاتی کارەسات و بەلا، بە پێوە و دانیشتن و راکشاندا لە خوا دەپاڕێتەوە، کاتێکیش خوای گەورە بەڵایەکەی لەسەر لادەبات، بێ ئاگا دەبێت و ساتەکانی پاڕانەوەی لەبیر دەچێت، ئەو نزایانەی لە حاڵەتی ناخۆشیدا دەیکردن لە یادی دەچن..

ئەم دیمەنە پڕ ئازارەی سوڕەتی (یونس) باسی دەکات، ئایەتی تریش شی دەکاتەوە بۆ ئەوەی جەخت لە گرنگی بابەتەکە بکاتەوە، خوای گەورە لە سوڕەتی (الزمر) دەفەرموێت ﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعْمَةً مِّنْهُ نَسِىَ مَا كَانَ يَدْعُوٓا۟ إِلَيْهِ مِن قَبْلُ ﴾ الزمر: ٨ واتە "ئادەمیزاد کاتێك ناخۆشی و زەرەرێکی تووشهات، هانا و هاوار بۆ پەروەردگاری دەبات و بەدڵشکاوی لێی دەلاڵێتەوە، پاشان کاتێك خوا دەرووی لێ کردەوە و ناز و نیعمەتی پێبەخشی، دۆعا و نزا و هانا و هاوارەکانی ئەوسای فەرامۆش دەکات".

هەروەها لە سوڕەتی (فصلت) دەفەرموێت ﴿ وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ فَذُو دُعَآءٍ عَرِيضٍ ﴾ فصلت: ٥١ واتە "زۆربەی ئادەمیزاد کاتێك ناز و نیعمەتی بەسەردا بڕێژین پشت هەڵدەکات و سەرپێچی دەکات و ملکەچی راستی نابێت و خۆ بەزل و گەورە دەزانێت و بەلای خۆیدا دایدەتاشێت، کاتێکیش ناخۆشی و نەهامەتی تووشهات، ئەوە نزا و پاڕانەوەی زۆر بەگەرم و کوڵ و پان و پۆڕە".

سوێند بەخوا من هەست بە شەرمەزاری دەکەم کاتێك قسە لەسەر ئەم ئایەتانە دەکەم..

مرۆڤ چەند پێداگیرە کاتێك پێویستییەکی هەیە، کاتێکیش پێویستییەکەی هاتەدی، لەبەر خۆشی باڵ دەگرێت و نزا و پاڕانەوە بۆ پەروەردگار بە سوپاسکردن و ستایشکردنی لەبیر دەچێت.

ئایا ئەمە ئەوە نییە، کە خوای گەورە وەسفی دەکات بەوەی تێپەڕ دەبێت و دەڕوات وەك ئەوەی هەر ئەویش نەبێت داوای لابردنی ناخۆشییەکانی لە خوا کردبێت؟!

ئایا ئەمە لە بیرچوون نییە کە پێشتر هیچ داوایەکی لە خوا نەکردبێت؟!

ئایا ئەمە پشت تێکردن و سەرپێچکردن نییە دوای ئەو هەموو "نزا و پاڕانەوە دورودرێژ و پانوپۆڕە"؟!

ئەی خوایە داوای لێخۆشبوونت لیٚ دەکەین..

کاتێك کەسی سەرنجدەر لە قورئان بیرلەوە دەکاتەوە کە چۆن خوای گەورە لە چەند شوێنی جیادا سەرزەنشتی ئەو کەسە دەکات لە حاڵەتی ناخۆشی لێی دەپاڕێتەوە و لە حاڵەتی خۆشیدا بیٚ ئاگا دەبێت، تێدەگات کە خوای گەورە دەیەوێت دڵ لە هەموو حاڵەتێکدا بە خوای گەورە بەسترابێتەوە..

ئەی خوێنەری بەڕێزی ئەم چەند دێڕە، پرسیارێکت لیٚ دەکەم، وەڵامەکەی با لە دڵی خۆت بێت، پرسیارێك وەك رازونیازێك لە نێوانمان بێت..

## پرسیارم ئەوەیە..

توخوا بەو ساتەدا تێپەڕیووی کە سواری (ئۆتۆمبێل یان فڕۆکە) بووبیت و بۆ هەر مەبەستێك بێت، سەرەتا کاروبارەکان بە ئاسایی تێدەپەڕن، بەڵام کاتێك تۆ لەناوەڕاستی ئاسمانی فڕۆکەکە توشی حاڵەتێك دەبێت، دەبینیت لەناو فڕۆکە ستافی فڕۆکەکە هەناسەبڕکێیانە وەك ئەوەی هەست بە مەترسییەك بکەن، هەستت لەو حاڵەتەدا چییە؟

ئایا نزای سەلامەتبوون لە خوا ناکەیت، ئایا بە شێوەیەکی خێرا شریتی گوناه و سەرپێچییەکان نایێتە بەرچاوت؟

ئایا ئەو هەستە نایێتە مێشکت گەر ئەمجارە بەسەلامەت دەرچووی کە مردنت بە چاوی خۆت دیت، تەوبەبکەی و بگەڕێتەوە لای خوا؟

ئایا بەو ساتەدا تێپەڕیووی؟

کەواتە ببینە چۆن خوای گەورە هەمان دیمەن وێنا دەکات، بەڵام لەسەر هۆیەکی گواستنەوەی هاوشێوە، ئینجا بیربکەرەوە کە چۆن خوا لەسەر ئەمە گلەییمان لیٚ دەکات، خوای گەورە لە سورەتی (یونس) دەفەرموێت ﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُسَيِّرُكُمۡ فِى ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمۡ فِى ٱلۡفُلۡكِ وَجَرَيۡنَ بِهِم بِرِيحٖ طَيِّبَةٖ وَفَرِحُواْ بِهَا جَآءَتۡهَا رِيحٌ عَاصِفٞ وَجَآءَهُمُ ٱلۡمَوۡجُ مِن كُلِّ مَكَانٖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ أُحِيطَ بِهِمۡ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنۡ أَنجَيۡتَنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٢٢﴾ فَلَمَّآ أَنجَىٰهُمۡ إِذَا هُمۡ يَبۡغُونَ فِى ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّۗ يَٰٓأَيُّهَا

ٱلنَّاسُ إِنَّمَا بَغۡيُكُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۖ مَّتَٰعَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُكُمۡ فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ یونس: ٢٢ - ٢٣ واتە "خوا ئەو زاتەیە کە لە وشکانی و دەریادا هاتوچۆتان پێدەکات، هەتا ئەو کاتەی کە لە کەشتیەکاندا دەبن و دەیانگوێزنەوە بەهۆی با و شەماڵێکی پاك و ئارامەوە و هەمووان دڵخۆشن پێی، ئەوە بایەکی توند و بەهێز و سەخت بەرە و کەشتیەکە بێت و هەڵبکات، لە هەموو لایەکەوە شەپۆل بۆیان بێت، ئیتر وابزانن کە دەورە دراون و (ڕزگار بوونیان ئەستەمە، ئا لەو کاتەدا خەڵکەکە بەسۆزەوە) هاناو هاوار بۆ خوا دەبەن، دڵنیان خوا نەبێت کەس ناتوانێت فریایان بکەوێت، لەکاتێکدا بیرو باوەڕو ئاینیان بە تەواویی پاك و پوخت و یەکلایی دەکەنەوە بۆ خوا، بۆیە بە سۆزوە دەڵێن: سوێند بە خوا ئەگەر لەم بەڵایە، لەم تەنگانەیە، رزگارمان بکەیت، ئەوە بەڕاستی دەچینە ریزی سوپاسگوزارانتەوە (٢٣) جاکاتێك خوا رزگاری کردن، خێرا ئەوان بە ناحەق دەست دەکەنەوە بەستەمکاری لە زەویدا، ئەی خەڵکینە: بەراستی ستەم کردنتان تەنها لەسەر خۆتان دەکەوێت و بەزیانی خۆتان تەواو دەبێت، ئێوە بەو ستەمکاریە خۆشی و رابواردنی ژیانی دنیاتان دەوێت، لەوەودوا گەڕانەوەتان هەر بۆ لای ئێمەیە و ئەوسا ئاگادارتان دەکەینەوە بەهەموو ئەو کارو کردەوانەی کە دەتانکرد".

ئای لەو رەوانبێژیەی قورئان..

سوێند بەخوا ئەو دیمەنە لەوەتەی ئەو ئایەتە دابەزیووە تا ئەمڕۆشمان هەر دووبارە دەبێتەوە..

ئەم دیمەنەی لە سورەتی (یونس) باسکرا، ئایەتی تری هاوشێوەی لە سورەتی (الإسراء) شی دەکاتەوە، ئایەتەکە پەردە لەسەر نەزانینی عەقڵی مرۆڤ لادەبات، گەر لەو گەشتە رزگاریشان بێت، چۆن لە مەترسییەکانی داهاتوو بێ ئاگا دەبن؟ جارێکی تر پەروەردگار لەبارەی هۆیەکانی گواستنەوە دەفەرموێت ﴿ وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِي ٱلۡبَحۡرِ ضَلَّ مَن تَدۡعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُۖ فَلَمَّا نَجَّىٰكُمۡ إِلَى ٱلۡبَرِّ أَعۡرَضۡتُمۡۚ وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ كَفُورًا ﴿٦٧﴾ أَفَأَمِنتُمۡ أَن يَخۡسِفَ بِكُمۡ جَانِبَ ٱلۡبَرِّ أَوۡ يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗا ثُمَّ لَا تَجِدُواْ لَكُمۡ وَكِيلًا ﴿٦٨﴾ أَمۡ أَمِنتُمۡ أَن يُعِيدَكُمۡ فِيهِ تَارَةً أُخۡرَىٰ فَيُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ قَاصِفٗا مِّنَ ٱلرِّيحِ فَيُغۡرِقَكُم بِمَا كَفَرۡتُمۡ ثُمَّ لَا تَجِدُواْ لَكُمۡ عَلَيۡنَا بِهِۦ تَبِيعٗا ﴿٦٩﴾ ﴾ الإسراء: ٦٧ - ٦٩ واتە "(خەڵکینە ئێوە)کاتێك لە دەریادا ناخۆشی و تەنگانە

تووشتان دەبێت، ئەوە هەرچی پەرستراو هەیە لە بیروهۆش و باوەڕتاندا نامێنێت و ون دەبێت جگە لەو زاتە (هاناو هاوار هەر بۆ زاتی خوا دەبەن تا رزگارتان بکات) بەڵام کاتێك (فریاتان دەکەوێت) و رزگارتان دەکات و دەتانخاتە وشکانیەوە، ئێوە پشت لە بەرنامەکەی دەکەن و روو وەردەگێڕن و نایناسن، بەڵکو زۆربەی ئینسانەکان ناشوکرو سپڵەن (٦٧) خەڵکینە ئایا ئێوە لەخۆتان ئەمینن خوا نەتانبات بەناخی زەویدا و لایەکی وشکانی نەڕوخێنێت بەسەرتاندا، یاخود بەرد بارانتان نەکات؟ !لەوەودوا هیچ کەستان دەست ناکەوێت فریاتان بکەوێت و پەناتان بدات!!؟ (٦٨) ئایا دڵنیان و ناترسن لەوەی کە جارێکی تر لە کەشتیدا ڕێتان بکەوێتە ناو دەریاوە، ئەوسا بایەکی بەهێزی سەخت هەڵکاتە سەرتان، ئینجا بە هۆی کافر بوون و یاخی بوونتانەوە نوقمی دەریاتان بکات؟ !لەوەودوا کەسیشتان دەست نەکەوێت بتوانێت داکۆکیتان لێ بکات لای ئێمە"!!

بیربکەرەوە چۆن ئایەتەکە ئاماژە بە نەزانینی مرۆڤ دەکات، کاتێك وادەزانێت گەر گەیشتە کەنار، ئارام دەبێت بۆیە بێ ئاگا دەبێت !قورئان هۆشداری دەدات لەوەی تەنانەت گەر لەسەر زەویش نیشتنەوە، ئەوا هێشتا لەژێر مەترسییەکی گەورەترن ئەویش رۆچوونە بە زەویدا وەکچۆن لە قارون روویدا، یان بەردبارانکردن وەك چۆن لە گوندی (سدوم) روویدا.

پاشان قورئان هۆشدارییەکی سەیرتر دەدات، ئەی ئەو کەسەی ئەمجارە لە مەترسی رزگارت بوو و گەیشتیتە کەناری ئارامی، جارێکی تر دەگەڕێتەوە بۆ هۆیەك لە هۆیەکانی گواستنەوە، ئەمجارە کاتێك رەشەبا (کەشتی یان فڕۆکە یان ئۆتۆمبێلەکەت) تێکدەشکێنێت دەفەوتێیت و بەخراپی لەناو دەچیت.

ئایەتێك باس لە هەمەجۆری مرۆڤەکان دەکات لە کاتی نەمانی ساتەکانی ترس وەك دەفەرموێت ﴿ وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَالظُّلَلِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ فَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ ۚ وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ ﴾ لقمان: ٣٢ واتە "کاتێکیش لە دەریادا شەپۆلێك ئابلۆقەی هاوەڵگەر و کافرەکان بدات، وەك کێوەکان گەورە بێت، ئەوە هاناو هاوار هەر بۆ خوا دەبەن زۆر بە دڵسۆزانە ملکەچن بۆ خوا، جا کاتێك فریایان دەکەوێت و رزگاریان دەکات و دەیانگەیەنێتە وشکانی، جا هەیانە بەردەوام دەبێت لە سەر

ڕێبازی ئیمان و دەمێنێتەوە لەسەر یەکتاناسینی خوای میهرەبان، (هەشیانە ڕێگەی نادروستی خۆی دەگرێتەوە)، جا کەس لە ئایات و بەڵگەکانی ئێمە نکول و پەیمان شکێنی ناکات جگە لە زۆردار و ناپاك و سپلە".

ئەم وێنەی کە قورئان لەبارەی گەشتکردن بە کەشتی و بەلەمەکان و هەمووجۆرە هۆیەکانی گواستنەوەی (فڕۆکە و شەمەندەفەر و ئۆتۆمبێل) چەندبارەی دەکاتەوە، بیربکەرەوە چۆن مرۆڤ توشی دوودڵی دەبێت، بە تایبەت کاتێك بە دۆخێکی سروشتدا تێپەڕ دەبێت، بۆ نمونە بایەك شڵەژان دروست بکات، کاتێکیش دادەبەزنە سەر زەوی پاڕانەوە و لالانەوەی لەبیر دەچێت..

بیر لەو وێنەیە بکەوە کە ئێمە پێیدا تێپەڕ دەبین و چەند جارێك ئایەتەکانی (یونس و الإسراء) بخوێنەوە، واتاکانی ئیمان و پەیوەستبوون بە پەروەردگارت بە جۆرێك بۆ ئاشکرا دەبێت کە هەرگیز بە یادت دا نەهاتووە..

مەبەست لەمەدا ئەوەیە، کەسی سەرنجدەر لە قورئان سەیر بکات چۆن خوای گەورە دڵێکی دەوێت بەردەوام لە حاڵەتی مەترسی و سەلامەتی هەر بەو ببەسترێتەوە..

**ئەمە هێڵە ڕێکخەر و حەقیقەتە گەورەکەی قورئانە، کە بریتییە لە بەردەوامبوونی جوڵەی دڵ بە باوەڕبوون بەخوا و پەیوەست بوون بەو زاتە پیرۆزە..**

گەر لە کۆڕێك یان مەجلیسك دابنیشت و پرسیار لەوانەی ناو کۆڕەکە بکەی لێیان بپرسی پێناسەی "هاوەڵایەتی و دۆستایەتی باش" چییە؟ لەوانەیە کۆمەڵێك پێناسەت بە سیفەتی دونیایی بۆ بێنن، بەتایبەت لەدوای گەشەکردنی چەمکی ڕۆژئاوایی "پێشخستنی خود" کە پێوەرە مادییەکان باس لە دیدگای ژین و سەرکەوتن دەکات.. بەڵام کەسی سەرنجدەر لە قورئان لە سوڕەتی "الکهف" پێناسەیەکی سەرسوهێنەر بۆ هاوەڵایەتی و برادەرایەتی باش دەبینێت، خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی دەبینێت ﴿ وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ ﴾ الکهف: ٢٨ واتە "ئارام بگرە و خۆت ڕابگرە لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە خواپەرستی دەکەن و یادی پەروەردگاریان ویردی سەرزاریانە لە بەرەبەیان و دەمە و ئێواراندا".

سوێندت دەدەم بەو کەسەی تۆی دروستکردووە، ئایا لەهەموو ئەو گوتارە فیکرییانەی ئەمڕۆ بگەڕێی کەس دەبینیەوە پێناسەی "کەسایەتییەکی جیاواز" بەو شێوەیە پێناسە بکە..

سەیرکە چۆن سورەتی" الکهف" تایبەتمەندی کەسی جیاواز دیاری دەکات کە بریتییە لەو کەسەی کە (یدعو ربه بالغداة والعشي).

چ شەرمەزارییەکە لەو زەمەندا، کە شەرم لە ڕاستییەکانی قورئان دەکەین!

کاتێك خوای گەورە پەیامەکەی بە موسا (سلاوی خوای لەسەر بێت) سپارد، موسا داوای لە خوا کرد کەسێك بکاتە وەزیری بۆ ئەوەی لە گەیاندنی ئەرکی پەیامەکەی یارمەتی بدات، ئەویش هارونی برای بوو، بەلام مەبەستە دوورەکە لەو یارمەتیدان و دەستبارگرتنەی یەکتری نێوان هەردوو برا چییە؟ سەیر کە چۆن موسا ئەرکی پشتبەستن بە براکەی هارون لە سورەتی (طه) روون دەکاتەوە ﴿ وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي ٢٩ هَٰرُونَ أَخِي ٣٠ ٱشۡدُدۡ بِهِۦٓ أَزۡرِي ٣١ وَأَشۡرِكۡهُ فِيٓ أَمۡرِي ٣٢ كَيۡ نُسَبِّحَكَ كَثِيرٗا ٣٣ وَنَذۡكُرَكَ كَثِيرًا ٣٤ ﴾ طه: ٢٩ - ٣٤ واتە "لە کەس و کاریشم هاوکار و یارمەتیدەرێکم بۆ بڕیار بدە (٢٩) (حەز دەکەم) هاروونی برام بێت (٣٠) خوایە پشتمی پێ بەهێز بکە (٣١) بیکە هاوبەش و یاریدەدەرم، لەگەیاندنی (پەیامەکەتدا) (٣٢)تا تەسبیحات و ستایشی تۆ زۆر بکەین (٣٣) زۆر یادی تۆش بکەین و ناوی تۆ بەرین".

پێم وابێ ئێستا سەرنجت داوەتە ئامادەیی جوانی (یادی خوا) لە بونیاتنانی پەیامەکە، موسا بە خوا دەفەرموێت، هارون بکە یارمەتیدەرم بۆ ئەوەی تەسبیحات و یادی تۆ زۆر بکەین! واتا لە پێناو تەسبیحات و یادکردنە!

ئایا بابەتەکە لێرەدا کۆتایی پێ دێت؟ نەخێر، بەڵکو خوای گەورە موسا و هارون دەنێرێتە لای فیرعەون و جارێکی دیکە پێیان رادەگەێنێت کە زمانیان بە یادی خوای گەورە بەردەوام بێت.

لە هەمان سورەتدا دوای چەند ئایەتێك دەفەرموێت ﴿ ٱذۡهَبۡ أَنتَ وَأَخُوكَ بِـَٔايَٰتِي وَلَا تَنِيَا فِي ذِكۡرِي ﴾ طه: ٤٢واتە پەروەدگار پێیان دەفەرموێت "موسا تۆ و براکەت بە موعجیزەکانی من بۆ گەیاندنی پەیامەکە بڕۆن بۆ لا فیرعەون، بەلام هەرگیز لە یادکردنی مندا سستی و کەمتەرخەمی مەکەن".

موسا دەیەوێت براکەی بکاتە وەزیر بۆ ئەوەی هاوکاری یەکتری بکەن لە تەسبیحات و یادی خوای گەورە، لەبەرامبەریشدا خوای گەورە ڕەوانەیان دەکا و پێیان دەفەرموێ کەمتەرخەمی و سستی مەنوێن لە یادکردنمدا..

سەیری ئەرکە قورسەکە بکە کە ئەو دووە هەڵی دەگرن، بریتییە لە ڕووبەڕوو بوونەوەی دڕندەترین سیستەمی سەرکوتکار لە مێژوودا، بە جۆرێك ترۆیی و لوتبەرزییەکی ڕابچڵەکێنن، لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەورە پێیان دەفەرمویت "کەمتەرخەمم و سستی مەنوێن لە یادکردنمدا".

گەر ئەمڕۆ هەندێك لە بانگخوازەکان ئامۆژگارییەك پێشکەشی شۆڕشگێرانی سەر حکومەتە عەرەبییە گەندەڵەکان بکەن بەوەی پێیان بڵێن بەردەوام"یادی خوای گەورە" بکەن، بەشێکی زۆریان بە سەرسامییەوە ئەمە بە سادە و بێ سوود ئەژمار دەکەن، وێڕای ئەوەی موسا "یادی خوای گەورە"ی کردۆتەوە چەترێك بۆ بەجێگەیاندنی ئەرکە گەورەکەی، خوای گەورەش بۆیان جەخت دەکاتەوە کە سستی و کەمتەرخمی لە یادکردنەکەدا نەکەن..

شاهێد و نمونەکانی ئەم سەردەمە لە ئەمڕۆدا لەسەر نامۆیی چەمکەکانی قورئان چەند زۆرن، گەنجانی موسڵمانیش چەند لەو چەمکانە دوورن، مەگەر ئەو کەسەی خوا سەرکەوتووی بکا.

پاشان قورئان لە سوڕەتی (الحج) باس لە ڕێگەی وەرگرتنی ئایەتەکانی وەحی بۆ کەسی باوەڕدار دەکات، لێرەدا تەنیا جێبەجێکردنی حوکمەکانی قورئان مەبەست نییە، بەڵکو پێویستە لە دڵدا واتەیەکی تر بوونی هەبێت ئەویش "پشاندانی زەبوونی و کەساسییە" بۆ خوای گەورە. ئەویش بریتییە لە سەردانەواندنی دڵ و نەرمبوونییەتی لە ساتی وەرگرتنی قورئان ﴿ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَيُؤْمِنُوا۟ بِهِۦ فَتُخْبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمْ ﴾ الحج: ٥٤ واتە "بۆ ئەوەش ئەوانەی زانست و زانیاریان پێ بەخشراوە دڵنیابن و بزانن کە بێگومان ئەم قورئانە حەقیقەت و ڕاستە و لەلایەن پەروەردگاری تۆوە (ئەی محەمەد ) ﷺ ڕەوانە کراوە، ئینجا بڕوای پتەوی پێ دەهێنن و دڵەکانیشیان ملکەچ دەبێت بۆ خوا".

بەشێك لە ئەهلی تەفسیر واتای "الإخبات" لێرەدا وا لێكدەدەنەوە كە "نەرمبوونی دڵەكانیانە بۆ قورئان".

پاشان ڕێڕەوی بابەتەكە دەمانباتە سورەتی (المؤمنون)، لەوێدا دیمەنێكی سەرنجڕاكێشی ئاوەدانكردنەوەی دڵەكان بە خوای گەورە هەیە. بەو پێیەی زۆرێك لە خەڵكان پێیان وایە پێویستە كەسی باوەڕدار لە حاڵەتی "تاوان یان سەرپێچی" لە خوا بترسێت، بەڵام لە حاڵەتی "فەرمانبەردای" بەشێكی زۆری مێشكەكان پلەی ترسان لە خوای گەورە فەرامۆش دەكەن، بەڵام تەرازووی قورئان جیاوازە، زۆریش جیاوازە، ئەو دەیەوێت باوەڕ بە هەموو لایەنەكانییەوە بە پەرۆش و جۆش و خرۆشەوە بەسترابنەوە بە خوای گەورە، سەیر كە چۆن قورئان باوەڕدار لە ساتی ئەنجامدانی كاری چاكە وێنە دەكات ﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ أَنَّهُمۡ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ ﴾ المؤمنون: ٦٠ واتە "ئەوانەش كە دەبەخشن لە زەكات، لە كاتی ئەنجامدانی ئەم كارەیان دڵیان لە خوای گەورە دەترسێت، نەوەكو لێیان وەرنەگیرێت، چونكە ئەوانە بێگومانن كە بۆلای پەروەردگاریان دەگەڕێنەوە".

دەست بۆ بەخشین درێژ دەكات، دڵیشی لە خوای گەورە دەلەرزێت! ئەی خوایە هیچ رووتێكردنێك لە خوات بینیووە لەمە جوانتر بێت؟ !ئەگەر ئەمە داواكاری قورئان بێت لە حاڵەتی ئەنجامدانی (فەرمانبەرداریی)، دەبێت لە حاڵی ئەنجامدانی (تاوان) چۆن بێت؟!

لە سورەتی (النور) كاتێك خوای گەورە باسی چالاكییە بازرگانییەكان دەكات، باس لە گرنگی و هونەرییان ناكات، بەڵكو هۆشداری دەدات كە نەچن دڵەكانیان لە خوای گەورە غافڵ بكەن ﴿ رِجَالٌ لَّا تُلۡهِيهِمۡ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيۡعٌ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ ﴾ النور: ٣٧ واتە " پیاوانێك ستایشی خوا دەكەن كە بازرگانی و كڕین و فرۆشتن سەرگەرمیان ناكات و غافڵ نابن لە یادی خوا".ئەگەر ئەمە حاڵیان بێت لە میانەی بازرگانیكردنێكی ماندووكەر دەبێ لە كاتی بێ كاریدا و حەسانەوەدا چۆن بن؟!

لە واتا قورئانییەكان كە هۆشداری دەدەن بۆ پەیوەستبوونی دڵ بە خوای گەورە، چەمكی (روو لە دین كردن –إقامة الوجه للدين) و (تەسلیمبوونی خود بۆ خوا – إسلام الوجه لله).

ئەمانەش جۆرە دەربڕینێکن نیشانە و بەڵگەی قوڵایی دڵیان هەیە..

بیر لەو چەند ئایەتە بکەوە: خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ وَأَنْ أَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ﴾ یونس: ١٠٥ واتە "بەراست و ڕەوان ڕووت بکەرە ئاین و دینداری بەوپەڕی ملکەچی ودڵسۆزیەوە"، هەروەها دەفەرموێت ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ﴾ الروم: ٣٠ واتە "بە دڵێك پاك و بێگەرد و ڕاست و ڕەوان ڕووبکەرە ئاینی خوا و دینداری"، دەفەرموێت ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ الْقَيِّمِ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُ مِنَ اللَّهِ ﴾ الروم: ٤٣ واتە "کەواتە ڕووی خۆت بکەرە ئەم ئاینە پتەو و چاك و دامەزراوە، پێش ئەوەی ڕۆژێك بێت هیچ کەس نەتوانێت جڵەوی بگرێت و دژایەتی بەرنامەی خوا بکات" هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُ إِلَى اللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ ﴾ لقمان: ٢٢واتە "ئەو کەسەی ڕوو بکاتە پەروەردگاری و کارەکانی هەمووی بگێڕێتەوە بۆ لای ئەو، لە کاتێکدا ئادەمیزادێکی چاکەخوازە، ئەوە بەراستی مانای وایە کە دەستی بە بەهێزترین هۆکارەوە گرتووە".

گوێم لە زۆرێك لە ئەهلی زانست گرتووە، لەبارەی ئەوەی چ شتێك دوای "یەکتاپەرستی" زۆرترین جار لە قورئاندا هاتووە؟ بینیم باس لە چەند بابەتێك دەکەن، بەڵام من کاتێك تاقیم کردنەوە شتێکی وردترم لەمە بینی، ئەوەی بینیم وەکخۆم ئەوەیە کە: هیچ شتێك بەکردار دوای "یەکتاپەرستی" لە قورئان داوانەکراوە تەنیا "یادی خوا" نەبێت. ئینجا مەبەستی قورئان لەبارەی "جۆری زیکرەك" یاخود "یادی تاکانە" بێت.

لەبارەی جۆری زیکرەکە، وەك باسی قورئان لەبارەی ئەو ژن و پیاوانەی زۆر یادی خوا دەکەن، یاخود یادکردن بە دانیشتن و بە وەستانەوە و ڕاکشانەوە، یاخود یادی خوا شەوانە و ڕۆژانە، وازهێنان لە هەندێك شت کە دەبنە ڕێگر لە یادکردنی خوا، هۆشداریدان لە دڵڕەقی بەرامبەر یادی خوا، ملکەچبوونی دڵ بۆ یادی خوای گەورە.. لەگەڵ چەندان واتای تر کە جۆری یادکردنەکە دیاری دەکات، هەروەها باسی قورئان لەبارەی "یادی تاکانە" لە نمونەی تەسبیحات و سوپاسکردن و تەهلیل و تەکبیر و ... وەك تەسبیحاتی بوونەوەرەکان و دەستپێکردنی سوڕەتەکان بە سوپاسکردن و چەندانی تر... ئەمە زۆرترین داواکاری

کردارییە لەناو قورئان کە من دیتبم، بەڵام لە بارەی داواکاری خەبەری "نا کرداری" لە دوای یەکتاپەرستی بریتییە لە "رۆژی دوایی"، خوای گەورە باشتر دەزانێت..

ئەم دیاردەیەی قورئان– مەبەستم دیاردەی زۆرباسکردنی یادی خوای گەورەیە -پێم وانییە هەر کەسێك بیری لێ بکاتەوە بە ئیزنی خوای گەورە سەرپێچی بکات، کەسی سەرنجدەر لەقورئان زۆر بە ئاسانی هەستی پێ دەکات.. بەڵام شتێکی تر هەیە هەر لەبارەی تەفسیری ئەو بابەتە، ئەویش هەوڵی تێگەیشتنی پەیوەندی نێوان "یادی خوا" و "دڵی مرۆڤە" ئایا دەبێ پەیوەندی نێوان یادکردن و دڵ چی بێت؟ دوو ئایەتی گەورە لە کتێبەکەی پەروەردگار هەن کە ئاماژە بە نهێنی ئەو پەیوەندییە دەکەن، خوای گەورە لە سورەتی (الانفال) دەفەرموێت ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ ﴾ الأنفال: ٢ واتە "بێگومان ئیماندارانی راستەقینە تەنها ئەوانەن : کە کاتێك ناوی خوا برا، ئەوە دڵەکانیان دەترسێت و دەهەژێت".

هەروەها لە سورەتی (الحج) دەفەرموێت ﴿ وَبَشِّرِ ٱلْمُخْبِتِينَ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ ﴾ الحج: ٣٤ - ٣٥ واتە "مژدەش بدە بەبەندە ملکەچ و فەرمانبەردار و دڵ ئاوەدانەکان (٣٤) ئەوانەی کاتێك ناوی خوا برا (یا باسی دەسەڵات و رەحمەت و زات و سیفاتی کرا) دڵەکانیان دادەچڵەکێت و تەزووی پیادا دێت".

پێم وانییە نهێنی ئەو دوو ئایەتانە ئاماژەی بۆ دەکەن لەدەستت چوبێت، سەیرکە چۆن قورئان یادکردنی خوا و جوڵەی دڵ بەیەکەوە دەبەستێتەوە ﴿ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ ﴾ توخوا بە بوونی ئەو پەیوندەییە سەرسام نابیـت؟

بەهەرحاڵ، سەرنج بدە ئێمە کە دەستمان بەو نوسینەکرد بە چەند دیمەنێك لە حەوت ئایەتەکەی سەرەتای قورئان دەستمان پێکرد.. پاشان چوینە سەر دیمەنێکی تر لە ناوەڕاستی قورئان، با ئێستا بچینە لای دیمەنێکی تری هاوشێوە لە کۆتایی قورئان و سورەتە بچوکەکان..

لە نمونە سەرنجڕاکێشەکانی کۆتایی قورئان، سورەتێکە خوای گەورە تیایدا باس لە هەستی باوەڕدار دەکات، دوای ئەوەی ماندووبوونی جیهادی لەسەر لادەچێت و سەرکەوتن بە دەستدەهێنێت.. بەڕاستی قورئان بە درێژای ژیانی پێغەمبەر ﷺ دڵەکان بە سەرکەوتن دەبەستێتەوە، بەڵام ئەی دوای سەرکەوتن چی؟ خوای گەورە دەفەرموێت ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ﴿١﴾ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ﴿٢﴾ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ﴿٣﴾﴾ النصر: ١ - ٣ واتە "کاتێك یارمەتی و کۆمەکی و سەرکەوتنی خوا دێت، شاری مەککە رزگار دەکرێت و دەرگای ئازادی والا دەکرێت (١) خەڵکیشت بینی پۆل پۆل دەچنە ریزی ئاینی خواوە (٢) ئەوسا ئیتر تۆ سوپاس و ستایشی پەروەردگارت بکە و داوای لێخۆشبوونی لیّ بکە، چونکە بەڕاستی خوا زۆر چاوپۆشی دەکات و تەوبە وەرگرە".

لەدوا سورەت و لە دیمەنە سەیرەکانی قورئان لە گەیاندنی دڵ و دەروونەکان بە پەروەردگاری دورستکاریان، خوای گەورە تەنیا بە باسکردنی پەیوەستبوون بە خوا وازناهێنێت، بەڵکو لە یەك بابەتەدا لە پێناو هەمەجۆرکردنی سەرچاوەکانی پەیوەیستبوون، چەند جارێك ناوەکانی خۆی دەگۆڕێت!

سەیرکە چۆن دڵەکان چێژ لە بەندایەتیکردن وەردەگرن، لە کاتێکدا گوێبیستی ئەمە دەبن ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ﴿٣﴾﴾ الناس: ١ - ٣ واتە "(ئەی محەمەد ﷺ ئەی ئیماندار) بلّیّ: پەنادەگرم بە پەروەردگاری خەڵکی (١) بەپادشای خەڵکی (٢) بەخوای خەڵکی".

خوای گەورە فەرمانمان پیّ دەکات پەنابگرین و دەستبگرین بە خاوەندارییەتی پەروەردگار بۆ هەموو خەڵك ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾، گەر دڵ بەمە تێر بوو، دیمەنی (پادشایەتی خوای پەروەردگاری مەزن بۆ هەموو خەڵکی) بۆ دەکرێتەوە ﴿مَلِكِ ٱلنَّاسِ﴾، ئەو کات دڵ زیاتر دەستدەگرێت و پەنادەگرێت بە پادشاییەتی ئەو زاتە، پاشان سەرچاوەیەکی تر بۆ دڵ دەکرێتەوە ئەویش خوایەتی پەروەردگارە بۆ هەموو خەڵکی ﴿إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ﴾ تا دێت رێچکەی پەناگرتنی دڵی کەسی قورئانخوێن بۆ ئاسمان توندتر دەبێت.

قورئان دەیەوێت -لە سەرەتایدا تا کۆتاییەکەی- دڵی بەندەکانی بەمشێوەیە بێت..

ئەمانە تەنیا نمونەی هەڵبژێردراون لە جوزئەکانی قورئان، بە چەندان و چەندانی ترم جێهێشتووە، کە نوسینەکەی درێژدەکردەوە و بابەتەکەی زیاتر دەکرد، ئەو کەسەی بە وردبوونەوە و سەرنجدان قورئان بخوێنێت دەتوانێت ئەو پرسە کە بریتییە لە (ئاوەدانکردنەوەی دڵ و دەروونەکان بە خوای گەورە) لە هەموو ئایەتەکانی کتێبەکەی پەروەردگار ببینێت، هیچ ئایەتێك نییە لە ئایەتەکانی قورئان لەناوەخنیندا ڕێچکەی ڕۆیشتنی دڵەکان بۆلای دروستکار دڵەکانی تێدا نەبێت.

ئەم ڕێنوێنیە قورئانیانە لەسەر ڕێنماییەکانی گەورەی کوڕەکانی ئادەم ﷺ ڕەنگی داوەتەوە، فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ هۆشداری دەدەن لە وەرگەڕانی دڵەکان لای خوای گەورە، پێم وایە یەکێك لە فەرموودە سەرنجڕاکێشەکان فەرموودە دیارەکەی (بوخاری و موسلیم)ـە لەبارەی ئەو حەوت کەسانەی سێبەری خوای گەورە بە دەستدەهێنن لە ڕۆژێکدا کە هیچ سێبەرێك بوونی نییە جگە لە سێبەری ئەو نەبێت، یەکێکە لەو حەوت کەسەکە ئەوەیە "رجل قلبه معلق في المساجد، إذا خرج منه حتى يعود إليه" {البخاري: – ٦٦٠مسلم١٠٣١}، واتە پیاوێك دڵی بە مزگەوتەوە بەند بێت، کاتێك لێی دەردەچێت تا بۆی دەگەڕێتەوە..

سەیرکە چۆن پێغەمبەر ﷺ دڵی هاوەڵانی خۆی لەسەر پابەندبوون بە مزگەوت پەروەردە دەکات، بەراوردی بکە لەگەڵ بەشێك لەو بەناو بانگخوازانەی کە دڵی خەڵکی بە شتی دەرەوەی مزگەوت دەبەستنەوە.

ئەو واتایەی زۆر لە قورئاندا هاتووە، بریتییە یەکتاپەرستی، چەند جوان پێشەوا ئەبی عەبا ئیبن تەیمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت باسی کردووە "مەبەست لێرەدا لەو دوو دۆستە - موحەمەد و ئیبراهیم- ئەوانە تەواوترین ئەهلی تایبەتی یەکتاپەرستین..، تەواوبوونی یەکتاپەرستیان بە هێنانەدی تاقانەیی خوایی هاتۆتە دی. ئەویش بریتییە لەوەی کە نابێت دڵت جگە لە خەوای گەورە هیچی تری تێدابێت" {منهاج السنه:٥/٣٥٥ }.

ئەی خوایە ئەو واتایە چەند جوانە..

خوایە گیان دڵی من و دڵی برایانم جگە لە خۆت هیچی تری تیادا جێگا نەکەیتەوە..

بەڕاستی ئێستا دڵ و دەروونی مرۆڤایەتی وابەستەی دونیا و بێ ئاگایی لە ڕۆژی دوایی بووە، بۆیە ئایەتەکانی قورئان دابەزیوون، کە بنچینەی گوتارە بانگەوازەکەی بەستنەوەی مرۆڤە بە ڕۆژی دوایی، بێگومان گرنگترین شتیش دوای ئەمە ئامادەسازی هێزە، ئەمە خواستێکی دیاری قورئان و سوننەت و ڕاسپاردەکانی سەلەفە.. بەڵام بە داخەوە گوتاری بانگەوازی ماددیمان بۆ هات، کە هەوڵی ئەو سەرقاڵکردنی مرۆڤە بە دونیا، بێگومان لای ئەو ڕۆژی دوایی پاشکۆیە.. کۆمەڵە گوتارێك کە شەرم ناکەن بڵێن کێشەی موسڵمانان لە کەمتەرخەی دونیایانە نەك کەمتەرخەمی دینیان ! بەڵام تا ئێستاش– سوپاس بۆ خوا -لە باوەڕداران مەردانێك هەن، کە بەرامبەر ئەو پەیمانەی بە خوایان دابوو بە وەفا بوون، جا هەیانە پەیمانەکەی جێبەجێ کرد و مرد لەسەری، هەشیانە چاوەڕوانە، بەهیچ شێوەیەك گۆڕان و لاری رووی تێنەکردن.

بانگخوازانی خوا، ئەوانەی بەردەوام هەوڵی باسکردنی ڕووداوەکان دەدەن بۆ بەبیرهێنانەوەی خوا، ئەوان زاناترین کەسن بە ڕاستەقینەکانی کتێبی پەروەردگار، ئەوانەشی گاڵتە بە بەستنەوەی ڕووداوەکان بە خوا دەکەن و ناویناوە "زیادەڕۆیی لە دینداریکردن لە ژیانی گشتیدا" ئەمەش بۆ شێواندنی ئەو ڕۆڵە پیرۆزەیە، ئەوانەش نەزانترین کەسن بە ئاینی خوای گەورە، کە لە کتێبەکەی خۆیدا ئەم ئایینەی زۆربەجوانی ڕوونکردۆتەوە.

گەر دڵی کەسی سەرنجدەر لە قورئان بەم ڕاستەقینە گەورەیە تێر بێت، داری سەیر و سەمەرەی باوەڕ لە دەروونی بەر دەگرێت، تا وای لێدێت جگە لە خوای گەورە نەبێت هیچ تر لە دڵی ئەو جێگای نابێتەوە.. دڵی خۆی بێ بەری دەکات تەنها بۆ خوای پاك و بێگەر نەبێت.. داواکارییەکانی تەنیا بۆ لای خوای گەورە دەبات، ئەو کات هەست بە پشتیوانی و هێزی ئیلاهی دەکات وەك ئیبن تەیمیە دەفەرموێت "بۆیە بەشێك لە ئەهلی سەلەف دەڵێن: ئەوەی حەز دەکات ببێتە بەهێزترین کەس، با پشت بە خوا ببەستێت" {الفتاوی:٣٣/١٠}.

ئەو دڵەی ئاوڕناداتەوە لە داواکردنی رزق، یان گەڕان بە دوای شوێنی نیشتەجێبوون، یان گەڕان بە دوای کاردا، یان دواکردنی زانست، یان داواکردنی باوەڕ، یان داواکردنی تەندروستی و سەلامەتی، یان داواکردنی رزگارکردنی گیراو، یان سەرکەوتن لە شۆڕش.... بەڵکو بۆ لای خوای گەورە بەرز دەبێتەوە، تێکۆشانی بۆ کرداری دڵە، لەو هۆکارانەش بە گوێرەی شەرع هەڵسوکەوت دەکات..

ئایا کەس گومانی لا دروست دەبێت گەر بەراوردی نێوان داواکارییەکانی قورئان و کتێبە فکرییە سەردەمییەکان بکات، ئەو کتێبانەی باس لە هەڵسانەوە و پێشکەوتن دەکەن، ئێمە تا ئێستاش هێند دوورین لە هەڵسانەوە و شارستانییەت بە قەدەر دووری ئەو کتێبە فیکرییە سەردەمیانە لە ئامانج و ویستی قورئان؟

واتای باو لە وردەکاری ئایەتەکانی قورئان، بریتییە لە ئاوەدانکردنەوەی دڵ و دەروونەکان بە خوا، ئەمەش بەراستی حەقیقەتە گەورەکەیە لە کتێبەکەی پەروەردگار، خوای گەورە ناوی لە کتێبەکەی خۆی ناوە "حبل"، وەك دەفەرموێت ﴿ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا ﴾ آل عمران: ١٠٣ واتە "(هەوڵ بدەن) هەر هەموتان بە توندی دەست بگرن بە ئاینی خواوە". پێغەمبەریش ﷺ روونی دەکاتەوە لەوەی ئەو (الحبل)ـە بریتییە لەقورئان. وك دەفەرموێت "كتاب الله عزوجل، هو حبل الله"{صحيح مسلم: ٢٤٠٨} واتە کتێبەکەی خوای پەروەردگار بریتیە لە دینی خوا. ئاوەدانکردنەوەی دڵ و دەروونەکان بە خوای گەورە خواستێکی شەرعی پیرۆزە، پێشەوا ئیبن تەیمیە دەفەرموێت "دڵ ماڵی باوەڕەبوونە بە خوای گەورە و ماڵی ناسین و خۆشەویستی ئەو زاتەیە" .{الفتاوى:١٨/١٢٢٢}.

پێشەوا ئیبن قەیم لە (النونیە)دا دەفەرموێت "دڵ ماڵی خوای گەورەیە.. ماڵێك بە خۆشەویستی و دڵسۆزی لەگەڵ چاکەا"{النونية بتحقيق العمير:٣٦٦}.

مەبەست لێرەدا بێگومان ئەوە نییە کە خوای گەورە – بەرز و دورە لەمە - لە دڵی بەندەکانی جێی خۆی بکاتەوە بە تێگەیشتنی تەسەوفی فەلسەفی بێ کەڵك، بەڵکو مەبەست ئاوەدانکردنەوەی دڵەکانە بەو کردەوانەی خوای گەورە پێی خۆشە، هەروەها پشتتێکردن لە ئاوەڕدانەوە و ملکەچ بوون جگە بۆ خوای گەورە نەبێت لەسەر ڕێگای سەلەفی هیدایەتدراو..

بەهەر حاڵ... بێگومان خوای گەورە ویستی خۆی لە قورئان تا ئەوپەڕی روونی بۆ روونکردینەوە، داواکەرییە گەورەکەی لە کتێبەکەیدا بە چەند شێواز بۆ روونکردینەوە، لە کاتێکدا تەمەنیش بەرەو رۆخی گۆڕ هەنگاو دەنێت، ئای! رۆژی دوای چەند نزیکە!، ئەو رۆژەی خوای گەورە لەبارەی هێنانەدی مەبەستەکەی خۆی لە هەمووومان دەپرسێت، ئەو کات پرسیارەکە لەسەر (بنەمای قورئان) دەبێت، دەفەرموێت ﴿ قَدۡ كَانَتۡ ءَايَٰتِي تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَكُنتُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡ تَنكِصُونَ ﴾ المؤمنون: ٦٦واتە " جا ئێوە کاتی خۆی ئایەتەکانی ئێمەتان بەسەردا دەخوێنرایەوە کەچی پشتتان تێدەکرد و بەرەودوا دەگەڕانەوە و خۆتان لێ دەشاردەوە و دژایەتیتان دەکرد".

هەروەها دەفەرموێت ﴿ أَلَمۡ تَكُنۡ ءَايَٰتِي تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴾ المؤمنون: ١٠٥ واتە "ئایا کاتی خۆی ئایەتەکانی من بەسەرتاندا نە دەخوێنرایەوە، کەچی ئێوە بڕواتان پێی نەبوو، بە درۆتان دەزانی؟".

هەروەها دەفەرموێت ﴿ أَفَلَمۡ تَكُنۡ ءَايَٰتِي تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱسۡتَكۡبَرۡتُمۡ وَكُنتُمۡ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ ﴾ الجاثية: ٣١ واتە "باشە، ئێوە ئایەتەکانی منتان بەسەردا نەدەخوێنرایەوە؟ !کەچی خۆتان بەگەورە و زل دەزانی، بەڕاستی ئێوە هۆزێکی تاوانبار و تاوانکار بوون".

ئینجا بیربکەرەوە لەوەی چۆن ژیانی داهاتوو لەسەر بنەمای قورئان رێکدەخەی.. با هەریەك لە ئێمە سەیربکات بزانێت بنەمای ژیانی کامەیە؟

........................................................................................

# کۆتایی..

دوای ئەو گەشتە خێرایانەی لە گەورەیی کتێبەکەی خوا و نهێنییەکانی وردبوونەوە و سەرنجدان لە شکۆیی قورئان کردمان، زۆرێك لە خەڵك پرسیار لەبارەی شێوازی وردبوونەوە و سەرنجدان (التدبر) دەکەن؟ ئایا هیچ راسپاردەیەکی پوختە لەبارەی ئەو بابەتە هەیە؟

لە راستیدا من زۆرم لە بارەی (التدبر) بینیووە لەلای کەسانی تایبەتمەند لە تەفسیر، تێزی جوان جوانیان لە بارەی (تدبر القرآن) و خوێندنەوە و هۆکارەکانی نوسیووە، لە نمونەی (قواعد التدبر الأمثل)ی شێخ عبدالرحمن حبنکە المیدانی رەحمەتی خوای لێ بێت، (تحزیب القرآن)ی شێخ د. عبدالعزیز الحربی، (تعلیم تدبر القرآن الکریم)ی دکتۆر هاشم الادهل، (فن التدبر)ی شێخ د. عصام العوید، (المراحل الثمان لطالب فهم القرآن)ی هەمان دانەر، لەگەڵ چەندان کتێبی باشی تر لە هەمان بوار، ئەوانە تەنیا چەند نمونەیەکن..

بەڵام با ئێمە بیر لە هەندێك لە نیشانە گشتییەکانی ئەو بابەتە بکەینەوە، بە بڕوای من:

**یەکەم**: بەر لەهەر شتێك پێویستە مرۆڤ لە خوا بپاڕێتەوە و نزا بکات و پێداگری بکات کە خوای گەورە بیکاتە ئەهلی قورئان، تێگەیشتنی قورئان و کارکردن پێی بەڕوودا بکاتەوە، بیکاتە ئەوانەی لەبارەیانەوە دەفەرموێت ﴿يَتۡلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ﴾ البقرة: ١٢١ واتە "(قورئان) بەچاکی و بەوردی دەور دەکەنەوە".

مرۆڤ بە تەنیا بە هەوڵی تاکەکەسی و پلاندانان بۆ بەدەستهێنانی، دەرگای بەندایەتیکردنی بەسەردا ناکرێتەوە، بەڵکو کردنەوەی ئەو دەرگایە لە بەرەکەتەکانی پەناگرتنە بۆلای خوای گەورە، هەر چی دەرگای خێر و چاکەیە لە زانست و دین، هەموو بریتییە لە دەروازەی داوای یارمەتیکردن و پشتیوانی (الاستعانە)، بۆیە خوای گەورە راستەوخۆ لە (سوڕەتی الفاتحە) ئەمەی لە دوای بەندایەتیکردنی داناوە، داواشمان لێ دەکات رۆژانە دەیان جار دووبارە بکەینەوە (ئەمە واتای وایە ناوەرۆکەکەی رێکخراوە نەك هەروا داندرابێت)، لەو سوڕەتە پیرۆزەدا خوای گەورە داوای پشتیوانیکردن (الاستعانە)ی خستۆتە دوای بەندایەتیکردن (العبادە)، بۆیە داوای پشتیوانیکردن دەروازەی بەندایەتیکردنە.

**دووەم**: موسڵمان پێویستی بە (حزبێکی ڕۆژانە) لە خوێندنی (التدبر) هەیە، ئەمەش پێی دەگوترێت دابەشکردنی قورئان (تحزیب القرآن)، ئەسڵیش لەو بابەتە فەرمانی پێغەمبەرە ﷺ کە لە بوخاریدا هاتووە بە عەبدوڵای کوڕی عومەر دەفەرمویت "قورئان لە یەك مانگدا بخوێنە"، ئەویش پێی دەڵێت: من هێزی زیاترم هەیە، تا پێغەمبەر دەفەرمویت "لە هەفتەیەکدا بیخوێنە با لەمە زیاتر نەبێت" {البخاري:٥٠٥٤}.

پێغەمبەر ﷺ چوارچێوەی زەمەنی بۆ دابەشکردنی قورئانی ڕۆژانە لە نێوان (مانگێك و هەفتیەك) داناوە، واتا نە لە مانگێك زیاتر بێت نە لە هەفتەیەکیش کەمتر بێت، بۆیە هاوەڵە بەڕێزەکان (حزب) و دەورکردنەوەی ڕۆژانەی قورئانیان هەبووە، کۆمەڵی هاوەڵان قورئانیان بەسەر هەفتیەك دابەش دەکرد، بەم شێوەیە: ڕۆژی یەکەم سێ سورەت: (البقرة، آل عمران والنساء) لە ڕۆژی دووەم پێنج سورەت کە لەدوای ئەوان دێت، وەك لە (سنن)دا هاتووە ئەوسی کوڕی حوزەیفە دەڵێت "لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ م پرسی، چۆن قورئان دەکەن بە بەش (حزب)؟ فەرموویان: سێ، پێنج، حەوت، نۆ، یازدە، سێ زدە، حزبی تەواوی کۆتایش لە سورەتی (ق) تا سورەتی (الناس)". {أبو داود:١٣٩٠}.

سەرنج لەو دابەشکردنەی هاوەڵە بەڕێزەکان بۆ قورئان بکەن، ئەوان سورەتیان بەکارهێناوە، نەك جوزء و لاپەڕە، بۆیە پێشەوا ئیبن تەیمیە دەفەرمویت "هاوەڵەکان چەند سورەتێکی تەواویان دەکردە یەك حزب، نەك یەك سورەتیان کردبایە چەند حزبێك" {الفتاوی:٣/٤٠٨}.

ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە نابێت مرۆڤ خوێندنی (التدبر)ی ڕۆژانەی لەسەر گران بێت، جا هەر بارودۆخێکی بێتە پێش، دەوری ڕۆژانەی قورئان وەك گوێم لەپیاو چاکێك بوو دەیگوت: لە ڕۆژی یەکەم وەك شاخێکە، لە ڕۆژی دووەم وەك نیوەی شاخە، ڕۆژی سێیەم بچوکترە ڕۆژی چوارەم وەك ئەو خواردنە وایە گەر لە دەستبچێت ئازاری بۆ دەخۆیت.

**سێیەم**: ئەسڵ لەو بابەتەدا وردبوونەوە و سەرنجدانی کەسی و تەفسیرێکی دیارکراوە، نەك پێچەوانەکەی وەك هەندێك کەس دەیکەن، بەتایبەت ئەوانەی پاشخانێکی شەرعی گشتیان هەیە و لە زۆربەی ئایەتەکان دەگەن، ئیبن عەباس تەفسیری قورئان بەسەر چوار پلەدا دابەشکردووە (تەفسیر چوار جۆری هەیە: تەفسیرێك کە هیچ کەسێك گلەیی نەزانینی لەسەر لاناچێت، تەفسیرێك عەرەب بە زمانەکەی دەیزانێت، تەفسیرێك تەنیا زانایان دەزانن، تەفسیرێکیش جگە لە خوا کەس نایزانێت).. گەر ئەو دابەشکردنەی ئیبن عەباسی بلیمەت بهێنیتە بەرچاوت ئەوا دەزانی کە هەموو قورئان پێویستی بە تەفسیر نییە.

مرۆڤ قورئان بە پەراوێزی تەفسیرەوە دەخوێنێت، لەوانە تەفسیری ئاسان، یان تەفسیری (جلالين)، یان تەفسری (سعدی) یان هەر جۆری دیکە، گەر لە وشە و مانا کێشەی بۆ دروست بوو، دەگەڕێتەوە سەر پەراوێزەکە، گەر هەر دڵنیا نەبوو لە سەلامەتی (تدبر)ـەکەی با سەردانی تەفسیرە فراوانەکان بکات.

پێشەوای زانا و مەرجعەی فیقهی سوننەی سەردەم (إبن عثيمن) ڕەحمەتی خوای لێ بێت، جارێکیان لێ پرسیار کرا لەبارەی شێوازی دەستخستنی زانست و کامە زانستە لە هەمووشتێك گرنگە بایەخی پێ بدرێت، فەرمووی "دەڵێن: بەر لەهەموو شتێك بە تەفسیر دەستپێ بکە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە هیچی تر نەخوێنیتەوە، بەڵکو یەکەم جار جەخت لەسەر زانستی تەفسیر بکە.. پێویستە تەفسیر بخوێنیت، چەندی دەتوانیت سووربە لەسەری. سەبارەت بە ڕێگاکەشی: سەرەتا بەر لەوەی بگەڕێتەوە سەر کتێبەکان، بیر لە واتای ئایەتەکە بکەوە، گەر شتێکت لا دروست بوو بگەڕێوە لای کتێبەکان، ئەمەش بۆ ئەوەی خۆت لەسەر فێربوونی واتاکانی کتێبی پەروەردگارت رابهێنیت، پاشان خوای گەورە هەندێك جار دەرگای ماناکانی لە کتێبەکانی تەفسیرت بۆ دەکاتەوە کە بۆ هیچ کەسێکی تر نەکردۆتەوە، بەتایبەت گەر لەناو زانستەکە گەورە بوویت و گەیشتتە پلەیەك، ئینجا خەزێنەکانی ئەو قورئانە پیرۆزەت بۆ دەکرێنەوە کە لە هیچ بابەتێکی تردا ئەمە نابینیێ."{الباب المفتوح: ل٨٦}.

سەیری ئەو زانا و پێشەوایە بکە چۆن وەسیەتی قوتابییەکانی دەکات ئایەتەکانی قورئان بخوێنن و مانای لێ دەربهێنن پاشان بگەڕێنەوە سەر کتێبەکانی تەفسیر، بەڵکو تەنانەت بە کردار ئەم شتەی لەگەڵ

دەكردن، چەند ئایەتێكی پێ دەدان داوای لێ دەكردن بۆ دەرهێنانی ماناكانی شەونخونی بكەن و بەیانی بۆی بگەڕێننەوە.

لەدوای ئەمانە مرۆڤ تەفسیرە درێژدادڕەكان لە داهاتوودا بخوێنێتەوە لە نمونەی تەفسیری (الطبري و إبن كثير و إن عطية) و چەندانی تر.

**چوارەم**: لە هەمووشی جوانتر ئەمەیە مرۆڤ بەرنامەیەك بۆ خێزانەكەی لە ماڵەوە بۆ تەفسیر دابنێت، پاشان بیخوێننەوە و پێشبڕكێ بكەن لە دەرهێنانی ماناكان، دواتر بگەڕێنەوە سەر تەفسیرە كورتەكان، وەك خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ مَا يُتْلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلْحِكْمَةِ ﴾ الأحزاب: ٣٤ واتە "هەرچی لە ماڵەكانتاندا دەخوێنرێتەوە لە قورئان و فەرموودە یادی بگرن و فەرامۆشی مەكەن و باسی بكەن بۆ خەڵكی".

پێغەمبەر ﷺ قورئانی لەسەر خێزانەكانی دەخوێند، ئەمە كاریگەرییەكی ئەوتۆی هەیە كە زۆركەس پێشبینی ناكەن، لە ڕووی خۆشەویستكردنی قورئان لای كەسوكار و رووتێكردن و تێگەیشتنیان، بەڵكو دەبینی كەسوكارەكەت چۆن بەردەوام پرسیار لەبارەی تێگەیشتنیان بۆ قورئان و ڕێنوێنی ئایەتەكانی دەكەن، لەهەموو ئەمانەش گرنگتر، لە كەسوكارەكەت جۆرێك لە هێز و توانا لەسەر فەرمانبەرداری و دونیا بینینێكی جیاوازتر دەبینی، ئەمە قورئانە كە بەراستی لە هەمبەر ڕاستكردنەوەی چەمكەكان و دیدگاكان و بۆچوونەكان یەكجار سەیرە.

**پێنجەم**: هیچ دەرسێكی شەرعیم لە زانستە ئیسلامییەكان كە پێغەمبەر بە خودی خۆی ﷺ دایڕێشتبێت نەبینووە، تەنیا بەردەوامبوون لە خوێندنەوەی قورئان نەبێت، هەموو جۆرەكانی شەریعەت بریتییە لە جۆرێك لە ئیجتیهاد لە ڕێكخستنی زانست، تەنیا زانستی خوێندنەوەی بەردەوامی قورئان نەبێت، چونكە دەقی فەموودەی پێغەمبەر ﷺ ی لە (موسلیم)ی لەسەرە دەفەرموێت "هیچ قەومێك نییە لە ماڵێك لە ماڵەكانی خوای گەورە كتێبەكەی خوا بخوێنن و لەنێوان یەكتریدا دووبارە بیخوێنەوە،

تەنیا ئارامی و ئاسوودەییان بەسەردا دەباریت، سۆز و میهرەبانی خوا دایان دەپۆشێت، فریشتەکان دەوریان دەگرن، خوای گەورە بۆ ئەوانەی لای ئەون یادیان دەکات" {صحيح مسلم:٢٦٩٩}.

ئەمە گەورەترین وانەی شەرعییە کە خوای گەورە پێی خۆش بێت، چەند جوانە برایان لە نێوان خۆیان بەرنامەیەکی رۆژانە دابڕێژن هەر یەك لەوانە تەفسیرێکی دیاری بۆخۆیان دابنێن پاشان لەنێوان خۆیان واتاکان ئالوگۆڕ بکەن، ئەم بەرنامەیە توانای ئیمانی بە موسڵمان دەبەخشێت کە لە سەرکەوتن بەسەر قورساییەکانی ژیان یارمەتیان دەدات..

ڕێگاکان هەمەڕەنگن، بابەتەکەن تێکچڕژاون، کتێبە پسپۆرییەکان زۆرن، کەسی کەمتەرخەم شەرم لە ئامۆژگاری کەسانی تر دەکات کاتێك ئامۆژگاری دەکەن، بەڵام دەترسم لە تێفکرین و توێژینەوە لە بابەتێکی وەهادا نەمانتوانیبێت وەك پێویست قەدرمان گرتبێت.

بیرم لە ژیانی هاوەڵان و زانا بەڕێزەکان کردۆتەوە، سوێند بەخوا تێکۆشان و هەوڵەکانیان و رووکردنە قورئانیان منی سەرسام کرد، ئینجا تێگەیشتم چ شتێك ئەم خاسیەتەی بەوان بەخشیوە، سەیری ژیانی ئەبو عەباس ئیبن تەیمیە بکە، کە لەبواری تەفسیر پەیام و تێزی زۆری نوسیوە، وەك تەفسیر سوڕەتی (إخلاص) و بابەتی دووردرێژ لەبارەی تەفسیری سەلەف، تەفسیر سوڕەتی (نوح)... کاتێکیش بۆ دواجار لە قەلای دیمەشق بەندکرا، هەر چی کتێب و قەڵەم هەیە لێیان ستاند، ئینجا روویکردە قورئان و فەرمووی "بەڕاستی خوای گەورە ئەمجارە دەرگای ماناکانی قورئانی و بنچینەی زانستی بۆ کردمەوە، کە زۆرێك لە زانایان ئۆمێدی بۆ دەخوازن، پەشیمانم کە زۆربەی کاتەکانی خۆم جگە لە ماناکانی قورئان بە فیرِۆا" {العقوود الدريه:٤٤}.

ئەمە ئیبن تەیمیە پەشیمانە لە بەفیرِۆچوونی کاتەکانی بۆ بابەتەکانی تر جگە لە ماناکانی قورئان نەبێت، ئەمە لەگەڵ ئەوەی ناوبراو لە پێشەوایانی تەفسیر بووە ! ئەی دەبێ ئێمەی کەمتەرخەم بەرامبەر کتێبی خوای گەورە چی بڵێین؟

خوایە گیان بمانکەیتە ئەهلی قورئان، قورئان بکەیە هاوڕێی شەوانە و رۆژانەمان، خوایە گیان سوڕەتی (تبارك) بکەیتە شەفیعی گۆڕەکانمان، خوایەگیان سوڕەتی (البقرة و آل عمران) بکەیتە سێبەر و بەڵگەمان

بۆ ڕۆژی دووایی، خوایە گیان بە خۆشەویستیمان بۆ سورەتی (قل هو اللّٰه أحد) ئێمەت خۆش بوێت..

ئامین..

وصلی اللّٰه وسلم وبارك علی نبینا محمد وآله وصحبه.

له سەیرترین نهێنییەکانی قورئان و
لەهەمووشیان زیاتر جێی سەرنجە، ئەو
کاریگەرییە سەیرەیە کە دەروونەکان
لەکاتی گوێگرتن بۆی ملکەچ دەبن..
(کاریگەری و زاڵبوونی قورئان)
دیاردەیەك کە عەقڵ تێیدا دۆش داماوە

